# من ئادەمم

**نـووســـینی :** ئـــاکۆ حوســێن
**دیزاینـی ناوەوە:** زەردەشت کاوانی
چـاپـی یـەکـەم ١٤٤١ز- ٢٠٢٠ك
١٤* ٢١ ســم ، ١٢٠ لاپـــەڕە

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان - هەرێمی کوردستان
ژمارە سپاردنی (    ) ی ساڵی ٢٠٢٠ پێدراوە

# عەرشی عیشق

با و باران لەتەمەنی بەفر کەم دەکەن گوناھ و تاوانیش خۆشەویستی خودا. هەمووومان ئەوینێک لە ژیان قەرزارین سەرپشکین ئاخۆ ئەم ئەوینە بەکێ دەبەخشین بە خودا و پەیامبەرەکەی کە سەرەنجام لێی گەیشتن بە ڕەزامەندی خودایە یا موڵک و سامانی دنیا کە ئەنجامەکەی بە هەلاکەتدانی ڕۆحە.

ئیماندار خۆشەویستی خوداو پەیامبەرەکەی هەڵدەبژێری هەرچەند ژیان لەسەری قورس بێت باکی بە سامانی دوونیا نیە تەنها ئەوەندەی پێی بژیەت کەسبی دەکات، ئیتر هەوڵی دۆزینەوەی ئەم ڕێگاو ڕێچکانە دەدات دەیبەن بەرەو خودا.

ڕێگاکانی گەیشتن بەخودا زۆرن لێ باشترینیان شوێنکەوتەی ڕەوشتی پەیامبەرانن.

مرۆڤ ناتوانێ ڕاستەوخۆ بگات بە خودا ئەگەر بە باوەڕی تەواوەوە ئەم ڕێگا و ڕێچکانە نەبڕێ کەوا پەیامبەران دەست نیشانیان کردون.

بۆ لوتکەی باوەڕ کۆششی زۆر و کۆڵنەدان سەرەتای ڕێگاکەن، ڕاستترین بەحەقترینیش ڕێگای پەیامبەر محمدﷺ.

ئەو چەند دێرەم نوسی، هەولمدا لە ژورەکەم بێمەدەر هەوایەکی پاک هەڵمژم پشوێک بە میشکم بدەم قومێ لەم ئاوە ساردە بخۆمەوە کەوا

دایکم بەیانیان زوو بەدەستە پیرۆزەکانی سازی دەکرد، دەمێک بوو خەریکی خویندنەوە بووم چاوم بەشێلویی دەیبینی شەوی ڕابردوش هەر خەریکی گەیشتن بە زانیاری بووم. لە ئاوێنە سەیری خۆم کرد دەماری چاوەکانم پڕی خوێن بوون ماندوێتی بڕستی لێبڕی بوون، ڕوخسارم ئاسایی نەبوو ڕەنگی مردووم لێنیشتبوو هەستم بە ماندوێتی و بێهێزی زۆر دەکرد ریشم زۆربوو قژم تێک ئاڵۆزکاو بوو دەستێکم پێداهێنا هەڵوەری تاڵەکانی بەدەستمەوە نوسان، کێشم کەمی کردبوو لەچاو بالاّم زۆر لاواز دەهاتمە بەرچاو، دەمێکبوو ئاوها لەنزیکەوە خۆمم نەدی بوو، ئاهێکی قوڵم هەڵکێشا خەریک بوو سوێم دەبۆوە بۆ ئەو جەستەی کە پاشە ڕۆژی دارزانە، خەندەیەکم کرد بەخۆمم گووت:

ئەگەر ڕۆح ئاسودە بێت جەستە ئەرزشێکی نیە. گورج بەرەو ئاوخواردنەوە هەنگاوم نا ئەو گلاّسەی سەر ترمزی ئاوەکە شوشە بوو بەشێکی لێوی شکابوو ئاوم پێی نەخواردەوە گلاّسەکەم خستە تەنەکەی خاشاک لەبەر ئەو فەرمودەی پەیامبەر محمد ﷺ کە دەفەرموێ: (خواردن و ئاو لە شتی شکاو مەخۆن و مەخۆنەوە). لەسەر کەوەنتەرەکە قاپێکی قووڵ هەبوو ناوی خوام لێهێناو دانیشتم ئاوم پێ خواردەوە زۆر سوپاسی خوام لەسەر ئەو نیعمەتە کرد، بۆ ئەوەی کەمێک ئۆکسجین هەڵمژم لەژێر سێبەری دار تووە گەورەکەی باخچەی ئەوبەری ماڵ لەسەر چیمەنە فێنکەکە دانیشتم بۆنی گوڵەباخ و پونگ و ڕێحان کاسیان کردم ئاسودەیی گەیشت بە دڵ و دەرونم هەستم بە حەساوەیی مێشک دەکرد نیوکاتژمێرێک بەوجۆرە مامەوە. تامەزرۆیانە گەڕامەوە ژورەکەم تا نوسینەکە تەواو بکەم پێنوسەکەم گرتە دەست و بەو دێرە دەستم پێکردەوە...

(بۆ گەیشتین بە لوتکەی باوەڕ بەتەنها باوەڕ بوون بەخودا کافی نیە، ئەوانەی تەنها خواناسی بە کافی دەزانن بۆ لوتکەی باوەڕ خودایان نەناسیوە پەرستشیان ناکاملە، دەکرێ بەبێ پەیامبەریش خودا بپەرستی بەڵام هەرگیز نایناسی)

لەنێو دێڕی ئەو کتێبانەی لەسەر مێزەکە لەبەر دەستم بوون چاوێکم گێڕا سەیری کۆمەڵێک بابەتی ئایینیم کرد هەمویان کۆک بوون لەسەر ئەوەی ڕێگاکانی خوداناسی زۆرن، لە چەندین مەدرەسەو پێگەی جیاواز و ئایینی ئاسمانی و زەمینی وەک وانە دەخوێندرێ، بەڵام باسکردن و پێناس کردنی خودا لەلای هەموویانەوە ورد نیە دژیەک و ناماقولی زۆری تێدا! تاقە ئاینێک و کەسێک زۆر بە وردی باسی خودای کردبێ ئیسلام و محمدﷺ کە خودا زۆرترین زانیاری دەربارەی خۆی لەڕێی ئەوانەوە گەیاند بە نەوەی ئادەم.

چاوێکیترم خشاند بە سەردەمی هاتنی محمدﷺ لەکاتێکدا بوو ژیان ئاسایی نەبوو پڕ بوو لە تاریکایی تەواوی ئەم چرایانەی لە پێشودا بەدەست پێغەمبەرانەوە بوو ڕوشناییان دەخستە بەرچاوی مرۆڤەکان کز ببوون یا کوژابونەوە، ژیان خاڵی بوو لە ڕووناکی تاریکستانێک گۆی زەوی تەنی بوو نیوەڕۆش ئەنگوستەچاو بوو لەم تاریکستانەدا لەم کاتە گونجاو و پیویستەدا خودا محمدﷺی نارد چرایەکی دا بەدەستەوە بەجۆرێک ڕۆشناییدا بە ژیان تاریکایی لەتیشکە بەهێزەکەی ڕایدەکرد تا قیامەتیش ئەم چرا هەمیشە ڕۆشنە دەسوتێ شەوق بە دڵی باوەڕداران پەخش دەکات (سوتەمەنیەکەشی بریتی بوو لە ناسین و خۆشویستن و پەرستنی خودا) خەڵکی سەرەتا لەم تیشکە ترسیان لێنێشت بە ساحیر پەیامبەریان ناوزەد کرد چونکە پێشتر ڕوناکی لەم جۆرەیان نەدی بوو لێی دەترسان ماڵومنداڵیان لێدەپاراست هەرکەس بەر ئەم ڕوناکیە

کەوتبا سەرپای دڵ و دەرونی دەگۆڕا ڕوخساری دەبوو بە پارچەک لە ڕۆشنایی. ئەم چرا هەمیشە درەوشاوەیە کەلامی خودا (قورئانی پیرۆز) بوو.

قورئان ئەم کتێبەی کەوا ئاڕاستەی ژیانی گۆڕی زەوی پێ ڕوناک کرایەوە تا ڕۆژی دواییش ئەم زەمینە بە گەشاوەترین ئەستێرەی دونیا دەهێڵێتەوە.

دیسانەوە خولقم لە نوسین نەما بڕیارم دا هیچ شتیک نەنوسم تێنوس و پێنوسەکەم خستە ناو جانتاو بەرەو مزگەوت چووم بۆ نوێژی عەسر جانتاکەم لەسەر رەفەی کتێبخانەی مزگەوت دانا چومە ریزی نوێژخوێنان نیەتم هێناو زۆر بە ئەدەبەوە راوەستام لەگەڵ خودا کەوتمە قسە، بۆی چومە رکوع و سوجدەم بۆ برد چێژم لەو ناچیزیەی خۆم دەبینی بەرامبەر خودا، چوبومە دونیایەکی دی پاش سەلام دانەوە ئایەتی کورسی و زیکرەکانم خوێند دەستم بەرز کردەوە پاڕامەوە مرادەکانم وەدی بێن لەسەرخێر، بەئارامی هەڵسام هەنگاوم هەڵێنا بەرەو جانتاکە.. هەڵمگرت، لە هۆڵی مزگەوت هاتمەدەر لە هەیوانەکە چاوم بە پیرە پیاوێکی نورانی کەوت دانیشتبوو زۆر جوان دەهاتە بەرچاو.. ڕیشێکی تەنکی سپی هەبوو چاوەکانی رەش و برۆی ئەستور و برژانگی دریژبوون، پێستێکی گەنمی بێگەردی هەبوو، باڵای بەرز نەبوو، ئەوەندەش لاواز نەبوو لەپێش چاوان، کەشیدەیەکی لە دەوری سەری پێچابوو، بەردەوام لێوەکانی دەجولا، پێشتر ئەم پیاوە پیرەم لە ریزی نویژ خوێنان بینی بوو، بەلام قەت وەک ئەمجارە لێی ورد نەبوومەوە ویستم بچم سلاوی لێبکەم خەندەیەکی بەڕووما کرد وەک ئەوەی پێم بڵێت ئەی بۆچی وەستاوی نایەی سلاوم لێبکەی! بزەیەکم کرد و دەستم بۆی بەرز کردەوە بەگەرمی سڵاوم لێکرد، گەرمتر

وەڵامی دامەوە، چیتر نەمتوانی لە دووری بوەستم لێی نزیک بوومەوە دۆقەم لەگەڵی کرد توند دەستی گوشیم ڕێگەی نەدا دەستە پیرۆزەکانی ماچ بکەم گووتی: یارمەتیم بدە هەڵسمەوە بڕۆم لە باخچە دانیشم.

حەوشەی مزگەوت زۆر گەورە بوو باخچەیەکی پڕ لە گوڵیشی تێدابوو پەرژینی باخچەکە داری مورتک بوو.

دەستیم گرت و بە یاالله قیت بویەوە گۆچانەکەی گرتە دەست و پێڵاوەکانیم بۆ جووت کرد زۆر بەو کارەم کەیفی هات سوپاسی کردم دەستی خستە ناودەستم بەیەکەوە تا باخچەکە چووین لەوێدا ویستم بگەڕێمەوە و ماڵئاوایی بکەم گووتی:

+ ئەگەر کارێکت نیە پێم خۆشە کەمێک لام دانیشیت.

- نـا، هیچ کارێکم نیە بەخۆشحاڵیەوە ئەگەر نەبمە بارگرانی زۆریشم پێ خۆشە لە حزورتدابم.

بەخەندەو روخسارە گەشاوەکەی فەرمووی لێکردم، لەتەکی دانیشتم گووتی:

خودا بەجۆرێک بەندەکانی خۆی خۆشدەوێ کۆمەڵێک تایبەتمەندی پێ بەخشیون بەهیچ جۆرێک بە دروستکراوەکانی دیکەی نەبەخشیوە, هەموو خەڵقندەکانی دیکەشی لەخزمەت مرۆڤدا موسەخەر کردوە، زۆر بەو قسەی سەرسام بووم خێرا تێنوسەکەم دەرهێنا دەستم کرد بە نوسینەوەی. گووتی:

+ ئەوە چی دەنوسیتەوە؟

- وشەکانت دەنوسمەوە چونکە زۆرم پێ جوان بوو.

درێژەیدا بە قسەکانی، گووتی:

+ پەیامبەر و قورئانی بۆ مرۆڤ ناردوە تا ڕێنموویان بکات بە ڕۆشنی ڕێگای بەهەشت بگرنەبەر کەوا پڕیەتی لە نازو نیعمەتی ئەقڵ پێ نەشکاو..

بەردەوام بوو لە دەربڕینە جوانەکانی و گووتی:

دەزانی خودا ئێمەی دروست کرد و ڕۆحی وەبەردا کردوین ئاوەزی پێداین خۆشی ویستین، کەچی بەشێک لە ئێمە توشی غرور دەبێ دەپرسێ بۆچی خودا بێ ئەوەی پرسم پێ بکا دروستی کردوم!

بەم حاڵەوەش مەودای دەدا تاوەکو تەوبە بکا پەشیمان بێتەوە لەم غروریە بۆ ئەوەی بەهەشتی بە قسمەت بکا.

گووتم:

- کاتێک خودا بەمجۆرە بەندەکانی خۆشدەوێ دەرفەتی زیاتریان پێ دەبەخشێ! مانای ئەوە نیە مرۆڤ نرخ و گەورەیی تایبەت بەخۆی هەیە؟

+ نا، ئەوەش لەگەورەیی و بەخشندەیی خودا خۆیەتی نەک ئەرزشی بەندە، دەنا ڤایرۆسیکی بەچاو نەبینراو کیفایەتە بۆ شکاندنی غروری بەندەی ناچیز، کەوایە گەورەیی و نرخی مرۆڤ لێرەدا چەندی بەچەند؟

ئەم پیرە پیاوە کەسێکی ئاسایی نەبوو زۆر لەوە ژیرترو خواناستر بوو کە بیرم بۆی چوو بوو، هەستم کرد ناسینی و دانیشتن لەگەڵی لەخۆڕا نەبووە ویستی خوا بووە ئێمەی بەیەک ئاشنا کردووە.

داوام لێکرد ڕۆژانە یەکتر ببینین و فێری خواناسیم بکات و وەڵامی پرسیارەکانیشم بداتەوە.

خۆشحاڵی خۆی دەربڕی و گووتی: هەموو ڕۆژ لێرەم لەناو باخچە چاوەڕێت دەبم تا گفتوگۆ بکەین، ئەو دەرفەتەم بە هەلزانی و پرسیاری دیکەم کرد گووتم:

– ئایا خودا پەرست خوا لەخۆی ڕازی بکات، مەرجە پاداشت لە دنیا وەرگریێ؟

+ بەندەی سالح بێ هیچ بەرژەوەندیەکی دونیایی خودا پەرستی دەکات چاوەڕێی پاداشت نیە وەک ئەرکی سەرشان فەرمانەکان بەجێ دەگەیەنێ دەترسێ لە عیبادەتیش کورتی هێنابێ، خودای پێ ڕازی نەکرێ لەخۆی چونکە ڕازی کردنی خودا بەو ئاسانیە نیە کەوا بە بیری بەندە دادێت.

– ئەی چی دەلێی دەربارەی ئەم ئایەتەی لە ژمارە ١٨٦ی سورەتی «بەقەرە» خودا دەفەرموێ:

((واذا سألک عبادي عني فإني قريب أجيب دعوة الداع إذا دعان فليستجيبوا لي...))

داوا لەخوا دەکەم بەڵام هیچ وەڵامێک نابینم؟

+ ئەوکاتەی لە بازنەیەکی بچوکی میشکتدا لە ژوریکی تاریک و تەنگی دڵتدا هاواری خوا دەکەیت و نایەت بەدەم هاوارتەوە مانای ئەوە نیە خودا گوێی لێت نیە بێ ئاگایە لێت، بەلکو چۆنیەتی هاوارکردنەکەت لەجێی خۆیدا نیە چونکە خودا لە میشکێکی بچوک و دڵێکی تەنگەبەردا جێی نابێتەوە، هەندێک جاریش خودا وەڵامت ناداتەوە، چونکە

١.. کاتەکەی گونجاو نیە.

٢.. باشتری بۆ داناوی.

٣.. لەدونیا ئەو شتە بۆتۆ نابێت هەڵی دەگرێ بۆ قیامەتت.

پەیوەندیەکی تەلەفۆنیم بۆهات.. ئیزنم لێوەرگرت تا وەڵام بدەمەوە، دایکم بوو گووتی: بۆ درەنگ کەوتی نەهاتیەوە؟ خێرا بگەڕێوە مال، پەیوەندیەکەی داخستەوە. بە پیرەپیاوەکەم گووت: ئێستا دەبێ بگەڕێمەوە ماڵ کەی بتبینمەوە تا قسە لەسەر ئەم سێ خاڵە بکەین، مەرەقم کردوە زیاتر بزانم.

بە دەنگە نەرمەکەیەوە بە روخسارە شیرینەکەی گووتی: باشترین کاتی رۆژ سەرەتای بەیانیە ئەوکاتانە پڕن لە بەرەکەتی خودا، پاش نوێژ لێرە دەبم ئەگەر بۆت کرا چاوەرێت دەبم لەم باخچەیە من دەبینیەوە.

جانتاو کەلوپەلەکانم کۆکردەوە مالئاواییم لێکرد بەرەو ماڵ هەنگاوم نا بۆ شێوی ئێوارە باوکم لەسەر خوانەکە هیچی بۆ نەخورا رەنگی تێکچوو بوو دایکم پرسیاری نەخواردنی شێوەکەی لێکرد بەڵام نکۆڵی کردو گووتی: برسیم نیە بۆیە کەمم خوارد.

لەگەل تێپەڕینی کات تێبینیم کرد زیاتر هەست بە خراپی حاڵی دەکرا دەمی خوار بوو کاتێک پرسیارم ئاراستە کرد زمانی قورس بوو نەیتوانی وەڵام بداتەوە بەلادا کەوت بەخێرایی گەیاندمان بۆ نەخۆشخانە لە پشکنینی سەرەتایی دەرکەوت شەپرە لایەکی جەستەی گرتوە لە ناوەندی چڕ خەوێنرا دایکم لە شوشەی پەنجەرەکە سەیری حاڵی باوکمی دەکرد کە پزیشک و پەرستارەکان چاودێری وردیان دەکرد فرمێسک لەسەر ڕوخساری جۆگەلەی کردبوو، گووتی: نامەوێ گلەیی بکەم لەخودا دەبێتە ناشوکری لێ ئەوەی بەسەر باوکتدا هاتوە دەزانم تاقی کردنەوەیەکی قورسە بەڵام هێزی بەرگە گرتنیم نیە. لەپڕمەی گریانیدا و هێز لە ئەژنۆکانی نما کەوت بە زەویدا خێرا خۆم گەیاندێ هەڵیگرم، گووتی: قورساییەک لەسەر دڵمە هیچ هێزێک باری سووک ناکا ناتوانم لەسەر قاچ بوەستم، لێم گەڕێ با بەدەردی خۆم

بتلێمەوە، ویستی قسەیتر بکا بورایەوە! بەخێرایی هاواری پزیشک و پەرەستارەکانم کرد خستیانە سەر گوێزەرەوەیەک بردیان بۆ پشکنین بە ڕاکردن بەدوایاندا ڕۆیشتم باوکم جێهێشت! دەرکەوت فشاری خوێنی دابەزیوە چارەسەری پێویستیان بۆ کرد دوای چەند خولەکیک هۆشی هاتەوە پەرستارەکە هێورکەرەوەی پێدا دووکاتژمێر خەوت لەنێوان دایک و باوکم خەریکی راکردن بووم لە دووبەشی جیاواز خەوێنرا بوون بە دیار باوکمەوە وەستابووم درەنگی شەوبوو ماندوێتی بڕستی لێ بڕیبووم فێر ببوم شەوان زوو بخەوم چاوەکانم خەویان تێزابوو سوورهەڵگەرابوون، ویستم سەرێک لە دایکم بدەمەوە بەڵام ئەو خۆی هات تەندروستی زۆرباش دیار بوو گەیشتە لام توند باوەشمان بەیەکدا کرد لەپڕمەی گریانمدا گووتم: ترسام، تاسام، وامدەزانی هەردوکتان لەدەست دەدەم لەم نێوەندەدا تیامابووم کەسیشم لانەبوو یارمەتیم بدا بەدەم قسەکردنەوە خەریک بوو خەو دەیبردمەوە لە کورسی چاوەڕوانی دانیشتم دایکیشیم بەدیار جەستەی باوکمەوە وەستابوو، من خەوم لێکەوت.

باوکم مرد! بوە ڕۆژی حەشر نەخۆشخانە پڕ بوو لە خزم و کەس خوشکەکانم هەموو هاتبوون پڕ بە گەرویان دەگریان مێردەکانیان هەوڵی هێورکردنەوەیان دەدان، براکانم بە بێدەنگی دەگریان و چاوەڕێی وەرگرتنەوەی تەرمیان دەکرد خوارزاو برازاکانم کە هاوزەی من یا چەند سالێک لەمن بچوکتر بوون بەدەم گریانەوە دەیانگوت باپیرە هێشتا زوو بوو، تاقە کەسێک زۆر کاریگەری بەسەرمەوە بوو دایکم بوو لەبەر خۆیەوە بەدەم گریانێکی نەرمەوە قسەیەکی ئیمامی عەلی دەکرد دەیگووت: جێهێشتنی خۆشەویستان لەمردن بە ئازارترە، باوکتان بەتەنها ڕۆیی منی جێهێشت. لەو دەمەیدا تەرمی باوکمیان ڕادەست کردینەوە دوو خوشکم لەتاوا بوورانەوە، دایکم نەیدەزانی دوای تەرمی باوکم بڕوا

یا بگەڕێتەوە لای دوو کچە بێ هۆشبووەکەی، تەواو شێوا لەشوێنی خۆی وەستا دەستی بە پێکەنین کرد! هەموان ئاوڕیان لێداوە بەڵام کەس گرنگی بەو رەفتارەی نەدا چونکە زانیان شێواوە، بەو دیمەنەی دایکم ڕووخام تێکوپێک شکام وردو خاش بووم کەڵکی کۆکردنەوەم نەبوو، گریانێک گریام هاوارێک دەنگم هەڵبڕی دایکم لە پێکەنین وەستا سەیری کردم بەرەو ڕووم هات هەوڵیدا جڵەوگیرم بکا بۆی نەکرا بەدەنگە نەرم و بەسۆزەکەی بانگی کردم چەندین جار بەسەریەکەوە گووتی: ئادەم، کوڕم ئادەم، وەرەوە هۆشخۆت چاوەکانم هەڵینا دنیا کشومات بوو لەسەر کورسی نەخۆشخانەبووم دایکم لەتەنیشتم بوو پێم گووت:

- با خێرا بڕۆین لە ناشتنی باوکم بەشدار بین ئێمە بەجێماوین.

+ نا کوڕەکەم بەجێ نەماوین باوکت هێشتا زیندوە سوپاس بۆخوا، تۆ خەونت دیوە ئاگام لێت بوو دەگریای هاوارت دەکرد زانیم خەونی ناخۆش دەبینی بۆیە وەئاگام هێنای.

بەرەو شوشەی پەنجەرەکە هەنگاومنا سەیرێکی باوکم کرد لەسەر قەرەوێڵەکە خەوێنرابوو حاڵی هیچ باش نەبوو بەدەست خۆم نەبوو گریام، دایکم هات لەباوەشی گرتم گووتی: دەزانم ماندووی پەیوەندیم بە براکانتەوە کردوە لەڕێگان بەیانیش خوشکەکانت ئاگادار دەکەمەوە ئێستاش بڕۆ دەستنوێژ بگرە شەونوێژ بکە دوعای خێر بۆ باوکە نەخۆشەکەت بکە چوومە بەشی دەستشۆرەکە خەریکی دەستنوێژ گرتن بووم گوێم لە غەڵبەغەڵب بوو زانیم براو برازاکانم هاتوون بەتوڕەییەوە بە دایکمیان دەگووت: بۆ زووتر ئێمەت ئاگادار نەکردەوە؟

لە شوێنی دەستنوێژگرتن هاتمەدەر دەستەکانم تا ئانیشکم ئاوی لێ دەچۆڕا بەخێراتنم کردن.

لەبری دایکم وەڵامم دانەوە گووتم:

ئەگەر زووتر خەبەری ئێوەمان دابا حاڵی باوکم باشتر دەبوو؟ ئەو تورەییەی ئێوە بەرامبەر دایکم ناحەقیە.

براگەورەکەم گووتی:

+ ئێمەش حەقمانەو باوکمانە پێویست بوو ئاگادارمان بکەن لەحاڵی، مەگەر ئەو مافەمان نیە؟

– با، مافی خۆتانە بەڵام ڕۆژانە پەیوەندیتان پێوەکردبا لە حاڵیتان پرسیبا سەردانتان کردبا، ئەوکات چ ئاتاج بە خەبەری ئێمە دەبوون.

+ ئێمە سەرقاڵی کارو بژێوی ژیانی ماڵ و منداڵین دەرفەتی سەردان و پەیوەندی بەردەوامان نیە.

– دەی لەبەر ئەوە زوو خەبەرمان پێ نەدان تا بەکارەکانتان ڕابگەن!

ئیدی بەسە شەرم بتانگرێ چۆن بوێری ئەوە دەکەن بەسەر دایکماندا هاوار بکەن؟

دایکم بزەیەکی کردو گووتی: کوڕەکانم تاکەی واز لەم دەمەقاڵیە ناهێنن؟

بۆ ئارام ناگرن تا ئەو بارەی بەسەرماندا کەوتوە خودا بیخات بەلایەکدا.

هەمووان لەگەڵ قسەکانی دایکم بێدەنگ بووین برازاکانم لەسەر کورسیەکان دانیشتن دایکم و براکانیشم لەبەردەم شوشەی پەنجەرەکە وەستان سەیری باوکمیان دەکرد.

پەرستارێکی گەنج کچێکی جوان بوو هات پشکنین بۆ باوکم بکات هەر زوو برازاکانم لێی کەوتنەخۆ دەستیان بە منجە منج کرد ئاخۆ کامیان بڕۆن قسەی لەگەڵ بکەن و ببن بە هاوڕێی بەڵام ئەو دەرفەتەیان بۆ نەڕەخسا چونکە براکانم زوو هەستیان پێکرد  هۆشداریان دا هیچ هەڵەیەکی وا نەکەن.

دوای تەواوبونی کاری پەرستارەکە دایکم خۆی قسەی لەگەڵ کرد، تەندروستی باوکمی لێپرسی لە وەڵامدا گووتی:

ئێمە درێخی ناکەین چارەسەری کۆتاییش لەدەست خودایە نزای بۆ بکەن لای ئەو هەموو شتێک ئاسانە، ویستی بڕوات گووتم: ئەرک نەبێ شوێنی نوێژ یا بەرماڵێکم چۆن دەست دەکەوێ؟

سەیرێکی کردم وەک بڵێی جیاواز منی هاتبێتە بەرچاو گووتی: دوام کەوە.

ئاوڕێکم لە دایکم دایەوە گووتی: بڕۆ کوڕم. برازاکانم گوتیان ئێمەش دەچین دایکم قبوڵی نەکرد بەتەنها دوای کەوتم ژورێکی نیشان دام گووتی:

+ لێرە دەتوانی نوێژ بکەیت و بەرمالیشی لێیە.

– دەتوانم بەرمالەکە ببەم و دواتر بیهێنمەوە؟

+ لەوە دەچێ زۆر دیندار بیت شەونوێژ بکەی  یانیش دینداریکی خراپ بیت وا نوێژت دواخستوە بۆ ئەم درەنگی شەوە.

– خوا خۆی دەزانێ بە نیەتی دڵەکان، باش و خراپ تەنیا رووکارە.

+ لەوە دەچێ خواپەرستێکی باش بیت، لەگەڵ خێزانەکەشتان جیاواز دەرکەوتی هەڵسوکەوتت وەک ئەوان نەبوو!

- لە مەسەلەی پەرستندا بەبڕوای من

خوداناسی پێش خودا پەرستیە بۆیە ئەوانەی زووتر خودایان ناسی باشتر پەرستیان  دوورکەوتنەوە لە شیرکی گەورەو بچووک هەرگیز هەڵەیەکیان لەپەرستشا نەکرد چونکە خودایان پێش پەرستن ناسی.

ئەم جۆرە مرۆڤانە هەمیشە جیاواز دەردەکەون، نزا دەکەم وەک ئەوان بم.

پێویستە برۆم کات درەنگی کردوە، زۆر سوپاسم کرد بەرماڵەکەم هەڵگرت گەڕامەوە هەمووان بەجۆرێکیتر لەدرەنگ کەوتنم گومانیان برد دایکم نەبێ، بەرماڵم لە قوژبنێکی هۆڵەکە ڕاخست و خەریکی شەونوێژ بووم، دوعام کرد پاڕامەوە فرمێسکم ڕشت ناچیزی خۆمم نیشاندا تا خودا رەحمێک بە باوکم بکات، بانگی بەیانی نزیکی کرد

کۆتاجار سوژدەیەکی درێژم برد گوێم لە تەقەی پێڵاوی ئافرەتان بوو تا دەهات نزیکتر دەبۆوە لەنزیکم وەستا گووتی: خوا قبوڵی بفەرموێ، سەرم بەرزکردەوە تەماشام کرد پەرستارەکەبوو! ئامینم فەرموو، سوپاسم کرد، گووتی: لە ڕوانگەی زانستیشەوە سەلمێنراوە سوژدەبردن سودی زۆرە بارگە نیگەتیڤەکانی مێشک لەناودەبات، خوێنی زیاتریش دەڕژێنێتە کەلەیسەر کەوا بۆ بەهێزی و گەشەی قژ بەسوودە.

گووتم: لە ڕوانگەی ئیماندارەوە

سوژدەبردن بۆ خودا شکانی ئەو لوتبەرزیەی ناخە نیشاندانی ناچیزی بەندەیە کەوا؛ ئەوپەڕی گەورەییە لای خودا ئەو بەندانە خۆشەویستتریشن کە بێ دەسەلاتی خۆیان دەسەلمینن بەرامبەر

گەورەیی و دەسەڵاتی ئەو خودایەی دروستی کردوین، لەبەرئەوە ئێمە گرنگی بەوە نادەین زانست لەبارەی ئەرکی ئایینی ئێمەوە چی دەڵێ چونکە ئەوەی خوداو پەیامبەرەکەی فەرموویانە لەسەرووی هەموو زانستێکە.

گووتی:

+ ناوتم نەزانی! ناوت چی بوو؟

- ئادەم.

+ منیش ژاڵەم هاوڕێکانم بە «ژوولی» بانگم دەکەن پێ خۆشحاڵم بە ناسینت. نهێنی جیاوازی تۆ لەگەڵ ئەوانیدی چیە؟ بە هۆکاری پیشەکەم لێرە بەریەککەوتنم لەگەڵ خەڵکیدا زۆرە کەسیانم وەک تۆ نەبینی!

- لەوانەیە تاقە شتێک منی لەوانیدی جیاکردبێتەوە باوەڕی پتەوە بەخوداو پەیامبەرەکەی.

+ هەمووان باوەڕدارن کەچی جیاوازیش نین!

- هۆکارەکەی ڕوونە ئەوان بێ ئەوەی خودا بناسن دەیپەرستن، شارەزای پەیامبەر نین و دوای کەوتون، قورئان دەخوێننەوە و لێی تێناگەن وەک ڕۆبۆتی بەرنامەڕێژ وان بیرناکەوە.

بەدەم گفتوگۆوە بووین بانگی بەیانی لە مۆبیلەکەم بەرز بۆوە، ئیزنم لێ خواست نوێژەکەم بکەم، ئەویش ڕۆیی بەدەم کارەکەیەوە.

کات بەرەو خۆرهەڵاتن بوو دایکم گووتی: ئێستا پەیوەندی بە خوشکەکانتانەوە بکەن با ئاگەداری حاڵی باوکیان بن. هەرچەند کاتەکەی زوو بوو بەڵام دایکم مکوڕبوو دەبێ بەم زوویە ئاگادار بکرێن. کاتیکیش

خوشکەکانم هاتن بۆ نەخۆشخانە کردیانە حەشر وەک لە خەونەکە بینیم هەمان دیمەن دووبارە بۆوە. دایکم خەریکی ئارام کردنەوەیان بوو، فایدەی نەبوو وازی لێهێنان ڕووی لەمن کرد گووتی: برۆوە ماڵ پشوێک بدە ئەم ژاوەژاوە بۆتۆ باش نیە، ئەوانیدی پێیان ناخۆش بوو چونکە دایکم لە هەموان زیاتر گرنگی بەمن دەدا، هۆکارەکەش منداڵی بچوکی ماڵ بووم زۆریش لە دایکم نزیک بووم. گەڕامەوە یەکەوڕاست خەوتم نزیکی بانگی عەسر هەڵسام نوێژی نیوەرۆم کرد. پەیوەندیم بە دایکمەوە کرد ئەحواڵی باوکم پرسی دیاربوو حالی باشترە لەمەترسی دەرچووە، گووتم: نوێژی عەسر بکەم دێمەوە نەخۆشخانە ئەوسا تۆ بگەڕێوە پشوو بدە. پێنج خولەکی مابوو بانگی عەسر بەخێرایی خۆم گۆڕی لەبەردەم ئاوێنەبووم  خەریک بووم قژم دادێنا گوێم لە بانگی مزگەوت بوو وازم لە ئاوێنە هێنا چونکە  داوەتی قسەکردن کرام لەگەڵ خوا خێرا بەدەم بانگەوە چووم تا لەگەڵ الله بدوێم. پاش نوێژ چاوم گێڕا پیرەپیاوەکەم بینی هەنگاوی دەنا بۆ باخچەکە زۆر دڵخۆش بووم دوای کەوتم سلاوم لێکرد زۆر رووخۆش بوو جارێکیتر منی دیتەوە دانیشتین هەواڵپرسی کردم بۆ دیار نەبووم. گووتم:

– باوکم دوێنێ جەڵتە(شەپرە) لێیدا لەنەخۆشخانەیە لای ئەو بووم بۆیە نەمتوانی لە نوێژی عیشا بێمە خزمەتت.

گووتی:

+ دەزانی.. پەیامی خودا زۆرن هەر قورئان نیە بەتەنها، بەڵکو قورئان بەشێکە لە پەیامی خودا هەموو شتێک لەم جیهانەدا پەیامێکی خودای هەڵگرتوە، بۆ نمونە «نەساغی» زەنگی ئاگادار کردنەوەیەوە بۆ بەندە هۆشمەندەکان.

– قسەکانت ڕاستن، بەڵام لە باسەکەی دوێنێ لەو سێ خاڵەی باست کرد دەمەوێ تێ بگەم ئاخۆ هۆکار چیە لە خاڵی یەکەم گووتت کات گونجاو نیە بۆ گیرابوونی دوعاکە؟

+ توشی زیان دەبیت هەرچەند زیانەکەشت قبول بیت خودا قبولی نیەو گیرای ناکا چونکە ئەو بەندەکانی خۆی خۆشدەوێ نایەوێ توشی زیان بن.

بۆ خاڵی دووەمیش

ئیستا پێت نابەخشی دواتر بە باشتر بۆت قەرەبو دەکاتەوە، یەکانگیرە لەگەر خاڵی یەکەم.

خاڵی سێیەمیش

ئەو بەشەی داوات کردیە، لە دونیا مافی توو نیە.

ئەتوو برۆنێ کاک...؟ ببورە هیشتا ناوی خۆت بەمن نەگووتوە ناوت چیە؟

– ئادەم.

+ برۆنێ کاکە «ئادەم» لەم جیهانە ون و شاراوەیە پڕیەتی لە پرسیاری بێ وەڵام ئەگەر بیر بکەینەوە خوردبینەوە دەبینین هەموو خەڵقندەکانی خودا وەڵامی پرسیارە گوتراو و نەگوتراو و درک پێ نەکراوەکانی ئێمەن، دەرئاسایی ئەم دونیایە لەوەدایە بەرلەوەی ئێمە پرسیار بکەین خودا وەڵامی تەواوی داوەتەوە لە ریگای سروشت و پەیامبەر و قورئان.

– چ کاتێ بیرکەینەوە، خورد بینەوە، تا بە وەڵامە شاراوەکان ئاشنا بین؟

+ هەركات ویستت دەتوانی بە وەڵامەكان ئاشنا بیت، بەڵام باشترین كات ئەو ڕۆژانەیە توشی بەڵایەک دەبیت، ئارامگرتنیش باشترین وەڵامە.

– لەحاڵی ئێستادا باوکم نەخۆشە، تا ڕادەیەک ئارامهمان گرتوە بەڵام فێرم بکە چۆن نزای بۆ بکەم؟

+ ئەگەر تۆزقاڵێک ڕۆحگەورەیی لە نزاکردنتدا هەبێ گیرابوونی لای خودا مەحاڵە چونکە گەورەیی هەر لایەق بەخودا خۆیەتی نەک بەندەی خودا، ناچیزانە بەرامبەر خوا بوەستە نزا بکە، نابێ جگە لە خودا پشت بە کەسیتر ببەستی  دەبێ ئەوپەڕی قەناعەتت هەبێ ئەوەی چارەی باوکت دەکات خودایە نەک پزیشک و دەرمان ،ئەوان تەنها هۆکارێکن بۆ چارەکردنی.

– بە کورتی پێناسەکی خودام بۆ بکە، کاتێک دەڵێن خودا گەورەیە.. مەبەست لەم گەورەییە چیە؟

+ گەورەیی خودا لە مێشک و خەیالی بەندە بەدەرە چونکە گەورەییەکەی لە قەبارەیدا نیە بەلکو لە دەسەڵات و پیرۆزیەکانیدایە.

– دەزانی بەهۆی قسەکانت زۆر زیاتر چوویت بەدڵمدا، پێتەوە دیارە بێ ئەندازە خوات خۆشدەوێ.

+ خۆشویستنی خودا بەدڵێکی پڕ ئیمان  دەکرێ نەک لەفزی بریقەدار و کرداری ڕیایی. لەسەر «وشە» بڕیار لەسەر کەس مەدە ئێستا وشەکان جێی متمانە نین، ئەو سەردەمە جوانترینی وشەکان لە دەمێک دێنەدەر هەرگیز کردارێکی باشیان ئەنجام نەداوە.

– ئەو جۆرە قسەکردنەی تۆ وایلێکردم بڵێم بۆخۆم بژیم و کارم بەسەر قسەو کرداری کەسەوە نەبێت.

+ لەدەستوری بنچینەیی «باوەڕدار» بۆخۆم دەژیم هەڵەیە، ڕەوای حەقیش نیە، بۆخوا دەژیم ڕاستە چونکە بۆخۆت ژیان کردن هیچی لێ وەبەرهەم نایە نە کۆمەڵگا قبوڵیەتی نە خودا.

– کۆتا پرسیار دەکەم و دەرۆمە نەخۆشخانە  بۆ سەردانی باوکم.

+ هەرچەند پێت خۆشە بپرسە، بەگوێرەی ئەو زانستەی هەمە وەڵامت دەدەمەوە، ئەگەریش پرسیارەکەت قورس بوو بە «نازانم» وەڵامت دەدەمەوە.

– کەنگی خودامان زیاتر خۆشدەوێ؟

+ هەمیشە لەو شوێنە زیاتر خودامان خۆشدەوێ کە پێویستمان پێیەتی بەتایبەت لەکاتی تەنگانەدا، بەڵام «باوەڕدار» هەمیشە پیویستی بەخودایە بۆیە زیاتر لەئێمە خودای خۆشدەوێ.

لەسەر ئەو وەڵامە باشانە زۆر سوپاسم کرد هەڵسام ماڵئاواییم لێکرد ڕۆیشتمە شوێنی دەستنوێژ لەوێ هەندێک خۆمم ڕێک خست قژم داهێناوە لەبەردەم ئاوێنەکە. لەبەر دەرگای مزگەوت بە تاکسیەک ڕێی نەخۆشخانەم گرتەبەر، لەوێ هەواڵی باوکم لە دایکم پرسی دیاربوو حاڵی بە تێپەڕبوونی کات بەرەو باشتر دەچوو، خوشکو براو برازاو خوارزام دانیشتبوون مۆبیلیان بەدەست گرتبوو لە دونیا دابڕا بوون. لەتەک دایکم دانیشتم دەستی خستە ناو دەستم گووتی: دەبینی کوڕم (ئاماژەی بە منداڵ و نەوەکانی کرد) ئەوە حاڵیانە ئاگایان لەخوداش نەماوە ئەم کاتە پیرۆزەی خودا پێی داون بە مۆبیل خەرجی دەکەن، بیرناکەنەوە لەوەی ئێستا باوکیان چەند ئاتاجی گەڕانەوەی چرکەساتێکی تەندروستە، نازانم چی وایکردوە بیرناکەنەوە لەم کات بەڕێکردنە، دەبێ ئەو شتە چیبێ ترسی ئەوانی ڕەواندۆتەوە لە قیامەت تەنانەت دەنگی

بانگیش هەراسانیان دەکا کاتەک لە مۆبیلەکانیان بەرز دەبیتەوە خیرا دەنگبڕی دەکەن.

توونـد دەسـتی دایکم گووشی بە نەرمیەوە گووتم: ئەوانە دوورن لە بەرنامەو ڕێبازی محمدﷺ لەبەر ئەوە لە ژیان دابڕاون بونەتە مرۆڤی نائاسایی هەمیشە بێزارو تورەو توند دەردەکەون هەست بە چێژی ژیان ناکەن بۆئەوەی بگەڕێنەوە دۆخی مرۆڤێکی ئاسایی پێویستە لەسەریان تۆبە بکەن واز لەو ڕێگا چەوتە بێنن گرتویانەبەر.

پزیشکی تایبەتمەند و چەند پەرستارێک هاتن بۆ لای باوکم تا بڕیاڕی کۆتایی بدەن ئاخۆ چیتر پێویست دەکا بمێنێتەوە لە ژێر چاودێری چڕ یا بیبەینەوە ماڵ، سەیرم کرد ژولی خاتونیان لەگەڵ نەبوو (وا گومان مەبەن دڵم بۆی پەرۆش بووبێ) بەڵکو ئەو لەهەموان دڵسۆزتر بوو بۆ خزمەتی باوکم. دوای پشکنینی ورد و دەربڕینی چەند وشەیەکی ئینگلیزی لەگەڵ پەرستارەکان پزیشکەکە بڕیاریدا باوکم حاڵی باش بووە دەتوانین بەیانی مامەلەی دەرچونی بۆ بکەین و بیبەینەوە. پاشان گووتی: پەرستارێک دەنێرم زانیاریتان بداتێ لەسەر چۆنیەتی چارەسەری سروشتی وەرزشی ڕۆژانە بەلکو بتوانێ لە رۆژانی داهاتوو بە شەقرە ڕێ بکات، دەنا ئەرکی قورستر دەبێ. براکانم گرژ بوون کاتێک گوێیان لەم قسانە بوو هێشتا پزیشکەکە لەوێ بوو بوە مشتومڕیان باسی خزمەتی بەنۆبەتی باوکمیان کرد، لەسەر ڕۆژەکانی حەفتە ڕێک نەکەوتن بەهۆی کارو سەرقالی ژیانیان دەرفەتی خزمەتی باوکمیان نەبوو. دایکم کۆی کردنەوە گووتی: کەس داوای لەئێوە نەکردوە بێن خزمەتی باوکتان بکەن، لەگەڵ ئادەم خزمەتی دەکەین ئێوە تەنها وەرن لەدەوری دانیشن تاوەکو هەست بە ڕەزیلی و تەنهایی نەکات. هەستم کرد دانیشتن لەدەوری باوکیشم لەسەر دلیان قورسە بەڵام باشتر بوو

لە خزمەتکردن و خاوێن کردنەوەو وەرزشکردن بە دەستو قاچەکانی، بە نادڵی ئەو داواکاریەیان پەسند کرد. پەرستار ژولی بەدەرکەوت سڵاوی کرد گووتی: پزیشکەکە پێی گووتوم کەوا ئێوە بەیانی دەردەچن پێویستە هەندێک فێرکاری چارەسەری سروشتیتان بۆ ئەنجام بدەم، کێ لەئێوە دەیهەوێ فێر بیت با لەگەڵم بێت، تەنها من و دایکم ئامادەییمان نیشاندا، بزەیەکی کرد گووتی: هەروەک بۆی چووبوم، فەرموون.

لەگەڵ دایکم دوایکەوتین سەرچەفەکەی لەسەر جەستەی باوکم هەڵگرت زۆر دڵسۆزانە جوڵەی بە دەست و قاچی دەکرد دوای چەند خولەکێک بەمنی گووت: فەرموو هەمان ئەو جولانە دووبارە بکەوە. دەستم بە کارەکە کرد کەموکوڕی زۆرم هەبوو بەڵام دایکم زۆر باشتر لەمن جوڵەکانی دووبارە کردەوە، ژولی خان دلخۆشی خۆی نیشاندا کەوا بەو زووییە فێرکاریەکەمان ئەنجام دا دەستی خستە گیرفانی کراسەکەی تا پێنوس و کاغەز دەربێنێ کاتی وەرزشەکانمان بۆ بنوسێ بەڵام تەنها پێنوسەکەی لابوو، گووتی: دەتوانی تا ژووری پەرستارەکان بێی لەگەڵم؟ لەوێ کاغەزی زۆر هەن کاتەکان و جۆری جوڵەکانت بۆ دەنوسم. دوودڵ بووم بەڵام دایکم بەوپەڕی متمانەوە پێی گووتم بڕۆم لەگەڵی، لە ژووری پەرستارەکان نەچومە ژوور لەبەر دەرگاکە وەستام ژولی گووتی: میوان لەبەردەرگا ناوەستێ فەرموونە ژوور. بەدەم داواکەی چووم، لەسەر کورسیەک دانیشتم مێزێک لەبەردەمم بوو لەوە دەچوو پەرستارەکان نانی لەسەر بخۆن، ژوورەکە زیاتر لە ئوتێل دەچوو سێ قەرەوێڵەی دووقاتی لێبوو. ژولی لەبەرامبەرم دانیشت گووتی:

+ ئێرە شوێنی حەسانەوەی پەرستارەکانە حەزم کرد لێرە دانیشین هەندێ قسە بەیەکەوە بکەین.

- لەبارەی حاڵی باوکم؟

+ نـــا، سوپاس بۆخوا باوکت باشە. بۆ ئەوەندە بیرت لای باوکتە.

- ئەو هەموو کەسێکی منە پێویستە لەوکاتانەی لەلای نیم بیرم لای بیت چونکە ئەو باوکە.

+ بابەتەکە بەلاڕێدا نەبەین باشە.

- کام بابەت؟

پێکەنی و گووتی:

+ دەرفەتێکم بدە قسەکانم بکەم ئەوسا لێم حاڵی دەبیت.

- باشە، فەرموون.

+ دوێنێ شەو باسی کوڕێکم بۆ هاوڕێ پەرستارەکانم کرد کاتێک وەسفیم بۆ کردن، قژ ڕەشێکی پیست گەنمی کاڵ، باڵای بەرز و ناوقەد باریک، چاوەکانی حەڵوایی و برژانگی درێژ و برۆی پان و کورت بوون. (هەستم کرد وەسفی من دەکات) لەقسەکانی بەردەوام بوو گووتی: دوێنێ شەو لەگەڵ کچەکان چوین بۆ دیتنی لەوێ نەبوو.

خۆم لەخەتدا و گووتم: ئەو قسانە چ سودێک بە نەساغی باوکم دەگەیەنن. واقی وڕما چاوەکانی ئەبڵەق بوون بەزۆر دانی بەخۆیدا گرت گووتی:

+ هەرگیز هەستت بە تەنهایی کردوە؟

- «تەنهایی» هەرگیز جێی نەدەهێڵام ئەگەر خودام لەگەڵ نەبا، هیچ بونەوەرێک بەقەد مرۆڤ تەنها نیە کاتێک هەموو شتیکی لەگەڵە خودا نەبێت.

+ وادیارە ناتەوێ لێم حاڵی بیت چونکە وەڵامەکانت هیچ پەیوەندی بە نیەتی پرسیارەکانی منەوە نیە.

بەخێرایی کات و جۆرەکانی وەرزشەکەی بەشێوەی ریزبەندی نوسی و دایە دەستم.

زۆر سوپاسیم کرد گەڕامەوە لای دایکم ڕەچەتەکەم رادەست کرد گووتم: بیپارێزە.

سەیری کرد خوێندیەوە برەک داما گووتی:

+ ئەم رەچەتەت نەخوێندەوە؟

- نـــا، لەبەرچی؟

+ فەرموو بیخوێنەوە.

بە بزەوە ڕەچەتەکەی بۆ ڕاداشتم! لێم وەرگرت خوێندمەوە واقم وڕما نوسی بووی:

پاش سڵاو...

،،من داوای نزیکی و هاوڕێیەتیت لێ دەکەم «ئادەم» ژمارەی مۆبیلەکەم لەخوارەوەی ڕەچەتەکە دەنوسم بەهیوام بیرێکی لێ بکەیتەوە پەیوەندیم پێوە بکەی.. چاوەڕێتم،،

سەیرێکی دایکم کرد! چاوێکی لێ داگرتم بە پێکەنینەوە گووتی: ئەو ڕەچەتە بدە بەمن تا ئەم دەرمانە وەرگرم، پێم وایە دەرمانێکی باشە چونکە سروشتیە.

قسەم نەکرد، تێبینی ئەوەم نەکردبوو هۆڵەکە کشوماتە! هەموان هەستیان بە نائاسایی نوسراوی دەرمانەکە کرد بۆیە بێ دەنگ گوێیان

لەمن و دایکم گرتبوو دەیانزانی دایکم بە «کۆد» قسەم لەگەڵ دەکات نهێنیەک لەو ڕەچەتەدا هەیە، داوایان کرد سەیرێکی بکەن، دایکم ڕەتی کردەوە نیشانیان بدات خێرا کاغەزەکەی پێچاو خستیە باخەڵی هەوکی.

بەیانی زوو تیشکی خۆر تەواوی کۆڵان و شەقامەکانی شاری تەنی بوو خەریکی ئامادە کردنی باوکم بووین تاوەکو بیبەینەوە ماڵ، کورسیەک لەوانەی تایەی پێوەیە بۆ باوکم ئامادەکرد کاتەک کورسیەکەی دیت چاوی فرمێسکی تێزا دواتر لەسەر ڕوومەتی جۆگەڵەی کرد.

دایکم دڵنەوایی دایەوە فایدەی نەبوو تا گەیشتینەوە ماڵێ زیاتر لە دە جار گریا، دایکم زۆر بەو حاڵەی باوکم دڵگران بوو بەسەرەخۆی نەدەهێنا. خوشکو براکانم تا نیوەڕۆی ڕۆژی دواتر مانەوە، دوای نانخواردن هەرکەس گەڕاوە ماڵی خۆی بەتەنیا لەگەڵ دایکمماینەوە بۆ خزمەتی باوکم، بەدرێژایی ڕۆژ بەدەوریەوە بوین بەتایبەت دایکم شەوانیش ئاگای لێ دەبوو باوکیشم تا دەهات حاڵی باشتر دەبوو چونکە جەستەیەکی بەهێزی هەبوو.

دوای حەفتەیەک ڕۆژێک دەمەو عەسر بوو ئیزنم لە دایکم وەرگرت بڕۆمە مزگەوت لەوێ پاش نوێژ لە باخچەی مزگەوت پیرەپیاوەکەم دۆزیەوە دانیشتنم لەگەڵی زۆر پێخۆش بوو قسەکانی کاریگەریان هەبوو لەسەر دڵ و دەرونم پاش هەواڵپرسینی حاڵی باوکم گووتی:

+ تەنها عەسران دێیتە مزگەوت بۆ نوێژ؟

– نا، بەڵام ئەو دوو سێ ڕۆژە لەبەر باوکم دەرفەتم نەبووە، ڕۆژانی پێشوتریش لەسەرکار بووم بەدرێژایی ڕۆژ .

+ خوا سەرت بخا کوڕەکەم، بەڵام فێربە

لە ئەنجامدانی کارەکەت دڵسۆز بیت نەک خۆکوژ.

– خۆکوژ! مەبەستت جەستەم بەهەلاکەت نەدەم وایە؟

+ بەڵێ کوڕەکەم وایە، جەستە ئەمانەتە دەبێ زۆر ئاگات لێی بێت مافی زۆرە بەسەرتەوە... ،،خودا ئەو بەندە چاکەکارەی خۆشدەوێ پێش ئەوەی مافی کەسی بەرامبەر بدات مافی جەستەی خۆی دەدات، ئەگەر کەسێک درک بە مافی جەستەی خۆی نەکات هەست بە مافی خەلکیش ناکات،، ئەوە یاسایەکی ئیمانیە، پەیڕەو کردنی هەر یاسایەکی ئیمانیش بەشێکە لە وەدەست هێنانی رەزامەندی خودا.

– «بەشێک» لە رەزامەندی خودا! مەگەر هەموو رەزامەندی خوا یەک بەش نیە؟

+ نا، هەر بەوجۆرەش نیە کە بیری لێدەکەیتەوە بەڵکو (هەموو ڕەزامەندی) خوا نادیارە کەس گرەنتی سەد لەسەدی رەزای خوای نیە، دەکرێ لە بەشێکی کاری چاکە وەدەستبێ هەتا ئەگەر ئەو کارە کەسێکی خراپیش ئەنجامی بدا.

– کەسی خراپ پاداشت وەردەگرێ لەسەر کارێکی چاک؟

+ بێ گوومان پاداشت وەردەگرێ خودا قبوڵی نیە حەقی بەندە بکەوێتە لای بەلکو بە زیادەوەش پاداشتی دەداتەوە، بەمەرجێک لەپێناو خودا بێت ناوی خودای لێهێنا بێت.

کات درەنگی کرد خەریک بوو تاریکایی خۆی دەخزاندە سەر زەوی و تەنگی بە ڕوناکی هەڵدەچنی، گووتم: ئیدی پێویستە بڕۆمەوە ماڵ سوپاس بۆ وانەی ئەمڕۆ زۆر شتت فێر کردم، گووتی: بڕۆ ئامانەتی خودا بیت منیش نوێژی مغریب دەکەم و دەڕۆمەوە.

که هاتمەوە دەرگای حەوشەمان کرابۆوە زەنگی دەرگام لێدا چوومە حەوشە دایکم مۆبیلی بەگوێی وەنابوو لەژوور هاتەدەر نەمزانی قسە لەگەڵ کێ دەکات بیستم پێی گووت ئەوە ئادەمی پاشای تەنهاییش هاتەوە بە پێکەنینەوە ماڵئاوایی لێکرد.

گووتم:

– ئەوە کێ بوو قسەت لەگەڵ دەکرد؟

بەگاڵتەوە وەڵامی دامەوە، گووتی:

+ حەواییێک بوو سۆراغی دەکردی.

– نازانم؛ ئەو ماوانە گۆڕاوی دەبینم گاڵتە دەکەی! مەسەلە چیە؟

+ ئەگەر پێت بڵێم لەگەڵ کێ قسەم دەکرد بەڵێنم پێ دەدەی بیری لێ بکەیتەوە؟

– بەڵێن بێت بیری لێ بکەمەوە.

+ ژاڵەی پەرستار بوو! بێ ئەندازە ئەو کچەم چۆتە دڵ کوڕەکەم، چونکە زۆر خزمەتی باوکتی کرد. ئەو شەوەی تۆ نەخۆشخانەت جێهێشت ئەو بەردەوام دەهات بۆلای باوکت لە گشت خوشک و براکانت زیاتر بەدەوریەوە بوو. ئێستا گوێ بگرە ئەمڕۆ یەکشەممە بوو تا پێنج شەممە مۆڵەتت هەیە بیری لێ بکەیتەوە.

– بەڕاستی!

+ بەڵێ.

– تۆ حاڵی باوکمت بیرچۆتەوە؟ مەگەر دەکرێ ئەوە تەندروستی باوکم بێت، بیر لە ژولی بکەمەوە!

+ پاش ئەوەی چویتە مزگەوت باوکت لە حەوشە بە شەقرە پیاسەی دەکرد، باسی ژاڵەم بۆ کرد چەند خزمەتی کردوە، هەروەها ئەوەشم پێگووت: ببێتە بوکمان سودی زۆری دەبێت. بزەیەکی هاتێ گووتی: دەبێ پەیوەندی پێوە بکەی هەر ئەمڕۆش قسەی لەگەڵ بکە.

– باشە، بیری لێدەکەمەوە کۆتا ڕۆژی حەفتە ئەنجامەکەت پێ دەڵێم.

توشی دوودڵی و ڕاڕایی هاتم دڵنیا بووم دوو هێندەیتر قژم هەڵدەوەرێ نانی ئێوارەم بەحاڵ بۆ خورا ڕۆیشتمە ژوورەکەم بەخوێندنەوە خۆم سەرقاڵ کرد، بۆم نەلوا فامی نوسینەکان بکەم لە کتێبەکانیش دوور کەوتمەوە پشتم بەدیوارەکەوە دا لاقەکانم ڕاکێشا دەستەکانم توند لەناویەک دەگوشی بەوجۆرە بەردەوام بووم تا میلی کاتژمێر خۆی گەیاندە یازدەی شەو، دەبوو لەوکاتە خەوتبام بەیانی دەچوومەوە سەرکار، بەڵام خەو لەچاوانم کۆچی کردبوو، جارێکیتر هەوڵمداوە خۆم بەو دەستنوسانە سەرقاڵ بکەم لە تێنوسەکەمدا یاداشتم کردبوو یەکەم نوسراو کەوتە بەردیدم سەرم سوڕما نوسرابوو..

،، خۆشەویستانی خودا کەسانی دڵ و دەرون بەهێزن ترس لە فەرهەنگیان نیە تاقە شتێک لێی بترسن خودایە نەک هیچتر،،

دووجار خوێندمەوە خەجاڵەتیم کێشا ئەوەندە شەرمم کرد لەخودا، نەمتوانی زیاتر بیخوێنمەوە چونکە پێویست بوو لەسەرم پشت بەخودا ببەستم چاونەترس بم دوودڵ نەبم یادی خودا بکەم بۆئەوەی سەرکەوم بەسەر ئەو دۆخە دژوارە. کات نزیکی یەکی شەو بوو ئاگام لێبوو هێشتا خەوم لێنەکەوتبوو پاشان خەو کەوتە چاوانم لەگەڵ بانگی مۆبیلم چاوەکانم کردەوە بەزۆر توانیم لە جێگاکەمدا بێمەدەر خەوێکی قوڕس بۆ بالیفەکە ڕاپێچی دەکردم، بەچاوی خەواڵوو دەستنوێژم گرت

ئاو لە روخسارم دەچۆڕا کاتێک چووم  سەرێکم لە باوکمدا قووڵ خەوتبوو دایکم لەسەر بەرماڵەکە دانیشتبوو دەستەکانی بەرز کردبۆوە دوعای دەکرد، ئاوڕێکی لێدامەوە گووتی: لەماڵێ نوێژ مەکە خێرا بڕۆ مزگەوت، هەمیشە وەها بخەرە مێشکت ماڵ نوێژی لێنایەت؛ تا ناچار بیت بڕۆیتە مزگەوت بۆ نوێژەکان.

بە جوڵەی سەر ئاماژەی ڕەزامەندیم نیشاندا، خێرا چووم شەرواڵم کردەبەر بەخێرایی بەرەو مزگەوت کەوتمە ڕێ، قەدەری خودا وابوو لەتەنیشت پیرەپیاوەکە وەستام لە ڕیزی دووەم بووین. نوێژی بەکۆمەڵی بەیانیان چێژی تایبەتی خۆی هەیە جیاوازە لەگەڵ نوێژەکانیتر بڕیارمدا دوای نویژ لەگەڵ پیرە پیاوەکە لەباخچە دانیشم گفتوگۆ بکەین و وانەی زیاترم فێر بکا، پاش نوێژ پێم گووت: دەرفەتت هەیە ئیستا وانەم پێ بڵێیەتەوە.

بەخۆشحالیەوە قبولی کرد وەکو پێشتر دەستم گرت و بەرەو باخچەی مزگەوت چووین. کاتێک دانیشتین گۆچانەکەی لەتەنیشت خۆی دانا ڕووی تێکردم بەو دێرە دەستی پێکرد گووتی:

+ رۆژانە خودا لەسەر زاری بەندەکانی بۆ پێنج جار بانگت دەکا تا قسەی لەگەل بکەی مانای ئەوەیە خودا تۆی لەبیر نەکردوە. بەندەی خراپ ئەوەیە بەدەم بانگکردنەکەوە ناچێت.

– ئەگەر بەندە  دەستی گیرابێ لەناو ئیش و کار بێت، نەتوانێ بەدەم بانگەوە بچێ لەکاتی خۆیدا، دەچیتە بازنەی خراپ؟

+ هیچ ئیش و کارێک سەروتر نیە لە بەدەمەچونی بانگی خودا.

– یانی لەوکاتەش کەوا خەریکی ڕزگار کردنی گیانی کەسێکیت؟

+ نا، ئادەم.. خودا لێرە دەرفەتی داویت گیانی کەسەکە رزگار بکەیت پاشان بەدەم بانگەوە بڕۆی.

- دەمەوێ شتێکت پێ بڵێم تایبەتە بە ژیانی خۆم، نازانم هاوکاریم دەکەی یا نا.

+ تا نەزانم ئەو شتەی دەتەوێ بیڵێی چیە؟ چۆن بتوانم بڕیار بدەم هاوکاریت دەکەم!

- ئەمەوێ هاوسەرگیری بکەم پێویستم بە ئەزمون و ئامۆژگاریتە.

+ هاوسەرگیری واتە ئارامیو حەسانەوەی ژیان.

پیاوی کامڵ بەو کەسە دەگوترێ هاوسەرێکی باشی هەبێت.

هەموو ماندوێتی و ژاوەژاوی دونیا بە یەک خەندەی هاوسەری باش دەسڕێتەوە.

ئەم دونیا فراوانە ئەگەر جوان و خۆشە ئەرزشێکی نابێ بێهاوسەر.

پیاو ماڵی پێویست نیە ئەگەر هاوژینێکی نەبێت.

- ئەوانە گەورەیی و نرخی ئافرەت دەردەخەن، بەڵام پێوەری هەڵبژاردنی هاوسەر بەڕای تۆ چیە، پێویستە لەسەر چ بنەمایەک بێت؟

+ دین، جوانی، دەوڵەمەندی، ناوبانگ، بنەماڵە.. ئەوانە پێوەرن دەتوانی بەیەکێک لەوانە هەڵیبژێری.

لەبارەی بنەماکەش موسڵمانیەتی کافیە.

- دڵنیا نیم هاوسەرگیری لەگەڵ ئەو کچە دەکەم یا نـا کە بۆیان دەست نیشان کردوم، بەڵام وشەکانت جێگەی پێزانینن لەکاتی پێویست سودیان لێ دەبینم.

بەیانی داهات خۆر بەدەرکەوت کاتی ماڵئاوایی بوو بە ڕوویەکی گەشەوە لێک دابڕاین، پێم باش بوو خواردنی بەیانی بکڕم ئەوسا بڕۆمەوە بەدەم یادی خوداوە بەرەو نانەواخانە ملی ڕێگام گرت سێ نانی گەرمم کڕی لە تەنیشتیشی دوکانی بەرهەمە سپیایەکان بوو پەقرەجێکی بچووکی ماستم هەڵگرت لەگەڵ پێدانی پارە بە ماستفرۆشەکە پێیگووتم: باوکت چۆنە باشتر نەبوە؟ ئەمشەو لەگەڵ پیاوانی گەڕەک تەمای ئەوەمان هەیە سەرێکی لێبدەین. خۆشحاڵیم نیشاندا و زۆریش سوپاسم کرد ماڵئاواییم کرد بەرەوماڵ کەوتمەڕێ، دایکم خەریکی ئامادەکردنی چایی بوو کاتێک نان و ماستی لەدەستمەوە بینی واقی وڕما پێشتر قەت نەمکڕی بوو لەبەرئەوە پێکەنی! زانیم ئەو پێکەنینەی لەچی سەرچاوە دەگرێ یەکەوڕاست گووتم: هاوسەرگیریش بکەم ناچم نانی بەیانیان بکڕم.

زیاتر پێکەنی گووتی: هەموو ئافرەتێک دایکت نیە دڵیێ لەخەوی سبەینانت بکا، خۆی بڕوات خواردن بکڕێ، کچی خەڵکی بەزۆر دەتنێرێ.

نانی بەیانیمان لەگەڵ باوکم خوارد کاتێک پێم گووت: شەو برادەرانی گەڕەک دێنە خزمەتت زۆر کەیف خۆشبوو گەشایەوە بە زمانی قورسەوە گووتی: دەزانم خودا لەبیری نەکردووم، هێشتا منی لەبیری ئەوانی دیکەدا هێشتوەتەوە داینەبڕیوم لە ژیان. فرمێسک بەچاوەکانی هاتنە خوار دایکم گووتی: هەندێک جار خودا بەندە خۆشەویستەکانی خۆی لەم ژیانە دادەبڕێ نەبادا توشی گوناهـ بێت تا بە پاکی بیهێڵێتەوە، لەبیری ئەوانیدی دەیسرێتەوە. دوای تەواو بوونی نانی بەیانی سفرەکەم لەگەڵ دایکم هەڵگرت بەخێرایی خۆم ئامادەی چونە سەرکار کرد لە کۆگایەکی گەورەی خۆراک کارم دەکرد خاوەن کارەکە پیاوێکی دینداری گوفت شیرین بوو هەموو خاڵەکانی موسڵمانیەتی جێبەجێ دەکرد زۆر

پێی سەرسام بووم ناوی کاک «دیار» بوو بەلام هاوبەشەکەی تەنها بە ناو موسڵمان بوو ڕێک پێچەوانەی دیار بوو هەمیشە تورەو توند بوو ناوی «تۆفان» بوو، زەینم دابوێ کڕیارەکانیش ئەگەر ناچار بان مامەڵەیان لەگەڵ ئەو دەکرد هەمیشە مێزەکەی ئەو چۆڵ بوو ناچار بەردەستەکەی خۆیشی دەناردە لای کاک دیار تا هاوکاری بکات بۆ بەڕێکردنی کڕیارەکان. ئەو ڕۆژەی چوومە سەرکار هاوکاری کڕیارێکم کرد فەردە برنجێکم بۆ هەڵگرت خستمە ناو ئۆتۆمبێلەکەی، دەستی خستە گیرفانی بەخشیشێکم بداتێ رەتم کردەوە گووتم: لەبەر خودا هاوکاریم کردوی پارەم ناوێت، دەستی رەق بوو نەیدەزانی چۆن پارەکە بخاتەوە گیرفانی وەستابوو هەر سەیری دەکردم

(ناحەقیش نەبوو چونکە ژیانی ئێستا بریتیە لە پارە، من تەنها کارمەندێکم بە موچەکی کەم ئیش دەکەم ئەو رەفتارەم بەڕای ئەو لە زیهنیدا ئاسایی نەبوو. دەبێ چۆن مرۆڤێک بم لەبیری ئەودا!) کاتێک گەڕامەوە شوێنی کارەکەم کاک تۆفان هات بە دەنگە گەورەکەی گووتی: لە پەنجەرەکەوە بینیم پارەت وەرنەگرت؟ دەبێ پارە وەرگری نیوەشی بدەیتە کۆگا!

بە دەنگێکی نەرم گووتم: ئەم جۆرە پارەیە لە هیچ کەس وەرناگرم لە پێناو خودا هاوکاری هەرکەسێک دەکەم پێویستی پێم بیت.

کاک دیار هات بێ ئەوەی بپرسی مەسەلە چیە زانی چیبووە گوێی لە دەنگی تۆفان ببوو وشەکانی بیستبوو رەوشتی منیش شارەزابوو دەیزانی کاردانەوەم چۆنە، گووتی: کاک تۆفان تۆ چاوت لەبڕە پارەیەکی کەمی بەخشیشە! شەرم ناتگرێ بەو دەوڵەمەندیە چاوت بڕیوەتە کەمە پارەیەکی دەستی کرێکارێک؟

دەستی خستە سەرشانم گووتی: دوام کەوە، بەیەکەوە دانیشتین لە ژووری ژمێریاری بەدەستی خۆی دوو چایی تێکرد بەدەم چایی خواردنەوە گووتی: زۆر مرۆڤم دیوە لەپێناو پارە چاوپۆشیان لە هەموو شتێک کردووە بەڵام تۆ ڕەتت کردەوە! لەکاتەکدا مافی خۆت بوو لەهەموو کەس زیاتریش پێویستت بە پارەیە.

خەندەیەکم کرد زۆر بەسادەیی گووتم: ڕەتم کردەوە چونکە نەمویست خێر بە پارە بفرۆشم، ڕزقی من لەسەر خودایە نەک دەست و گیرفانی خەڵک.

کاک تۆفان هاتە ژوور بە ڕوو گرژیەوە گووتی: دیار، کڕیارەکان چاوەڕێن ئەگەر تۆش هەر خەریکی قسەکردن بیت بۆ ئادەم گرنگی بە کڕیارەکان نەدەیت ناچارم بەتەنیا کار بکەم یا هاوبەشێکیتر بدۆزمەوە. کاک دیار بێ دەنگ هەستا بەدەم کڕیارەکانەوە چوو منیش خیرا بەرەو کارەکەی خۆم هەنگاومنا، ژەمی نیوەرۆم بە پێوە خوارد هیچ پشووم وەرنەگرت، کات دووی دوای نیوەرۆ بوو کارم تەواوبوو چوومە ژووری ژمێریار تێنوسێکی بچوکی کاک دیار لەسەر مێزەکەبوو کرابۆوە رۆژانە ناوی ئەو خۆراکانەی لەسەر دەنوسی لە کۆگا کەمی دەکرد بەڵام ئەمجارە ئەوەی لەسەری نوسی بوو هیچ پەیوەندی بە خۆراکەوە نەبوو بەدێرێکی جوان لە ناوەراستی پەڕەکە نوسیبووی:

،،لەسەر زاری بەندەیەکی سادەو ساکار زیاتر گەورەیی خودام بۆ دەرکەوت کاتیک هیچی نەبوو پیداگربوو خودا کافیە بۆ دەولەمەندی و رزقی دونیا،،

تێنوسەکەم داخست سەرمێزەکەم ڕێکخست گەڕامەوە ماڵ خۆم شۆرد پشوێکی کورتمدا لەگەڵ بانگی عەسر چوومە مزگەوت پاش

نویژ لە باخچەکە چاوەڕێی پیرەپیاوەکە بووم تا هات کەمێک بن دارەکەم خاوێن کردەوە گەڵا وەریوەکانم کۆکردەوە دەستخۆشی لێکردم گووتی: ئەگەر مرۆڤەکان «هاوکاری» یەکتر بکەن ژیان جوانتر و ئاسانتر بەڕێوە دەچوو بەڵام چونکە پارە هاتۆتە گۆڕێ، بوەتە شتێکی نامۆ. سوپاس ئەمڕۆ لەبری من گەڵاکانت کۆکردەوە. دەستمان بە گفتوگۆ کردەوە لەبارەی خودا.

+ گووتی:

،، هەستکردن بەخودا لەناخەوە واتە لە قووڵایی دڵەوە خودا ببینیت ئەوەش بەشێکی خوداپەرستیە بەشەکەیتری لەچاودایە،،

واتە نابێ بەتەنها لەناخەوە هەست بە خودا بکەین بەڵکو لە ڕێگەی چاویشەوە بە دیتنی فڕینی پێشکەیەک هەست بە بوونی خودا دەکرێ ئەگەر بەندە ڕۆشنایی چاوی هەبێت.

- ڕۆشنایی چاو! واتە چۆن؟

+ چاو وێنە دەگرێ دەیدات بە مێشکو شی دەکاتەوە، ئەگەر لێی خورد بۆوە دەگات بە خودا دەنا ئەو چاوە تاریکە ڕۆشن نیە.

- یانی هەر چاوێک خودا لە دروستکراوەکانیدا نەبینێ رۆشن نیە تاریکە؟

+ بەڵێ دروستە.

- لەوکاتەدا هەست بەچێژی خوا پەرستی دەکەی؟

+ خودا پەرستی چێژێکە بە رۆح تام دەکرێ نەک زار.

- یانی چۆن؟

+ ئاسودەییەک بە دڵ و دەرونتدا دەگەڕێ بۆت وەسف ناکرێ هیچ وشەیەک نیە پێناسی ئەو چێژەت بۆ بکات.

– ئەم چێژە پەیوەندی بە تەمەنەوە هەیە، واتە کەسێکی پێگەیشتوو و تێگەیشتوو زیاتر هەست بەو چێژە دەکات؟

+ چیژی خواپەرستی پەیوەندی بە تەمەنەوە نیە، نابێ تەمەن بکرێتە پێوەر، چونکە مێردمنداڵێک و گەنجێک و پیرێک هەمان شیرینی خواپەرستی دەچێژن کاتەک  لە قوڵایی دڵەوە لە ڕۆشنایی چاوەوە گەیشتوون بە خودا.

– زۆرباشە.. دەمەوێ لەسەر دادپەری خودا شتێکم فێر بکەیت.

+ دادپەروەری بەلای خوداوە لەسەر حەق بنیاتنراوە سەرئەنجامیش لێی وەدی هێنانی یەکسانیە.

– جیاوازی نێوان دادپەروەری و یەکسانی چیە کامیان گەورەترن؟

+ گومانی تێدا نیە دادپەروەری گەورەترە چونکە حەقی تێدایە بەڵام یەکسانی حەقی تێدا نیە.

– باسێکی بەهەشتم بۆبکە خۆشترین و شیرنترین بەشی چیە؟

+ گەورەیی و چێژی بەهەشت لە قیامەتدا دیداری خودا و پەیامبەرەکەیتی، دەنا ئەم سەرزەمینەش بەهەشتێکە.

– کۆتا قسەت لەبارەی وەسف و ناسینی خودا چیە؟

+ خوداناسی هۆشمەندیە، پەرستنی باوەڕداریە، جێبەجێ کردنی فەرمانەکانی سەلماندنی بەندایەتیە بەرامبەر خودا.

لە وەسفی خوادا هەرگیز ناتوانین‌و ئەقڵمان پێ ناشکێ لەوە پتر بنوسین کە خودا دەربارەی خۆی باسی کردوە، قەلەمێک هی خودا خۆیەتی و دروستی کردوە تۆش بەکاری دێنی بۆ نوسینی ئەم وشانەی تەعبیر لە گەورەیی ئەو دەکەن، دەبێ هەستی ئەم قەڵەمە چۆن بێ بەرامبەر خودا کە دەبینێ وشەکان لەئاستی گەورەیی ئەودا نین و دەسەڵاتیشی نیە بڵێ چیدی شەرمەندەم مەکە بەم وشە لاوازانە گەورەیی خودا وەسف ناکرێ. کۆتا قسەم بۆتۆ ئادەم  بەچاوی داخراو خودا نابینرێ ئینجا چاوی دڵ بێ یا چاوی سەر بیانکەوە با لە بینینی جوانی و گەورەیی خودا بێ بەش نەبیت ئەم چاوانە نیعمەتیکن خودا بەهەموانی نەبەخشیوە.

زۆر سوپاسی پیرەپیاوەکەم کرد لەسەر ئەم هەموو وانە بەپێزەی دەربارەی خودا.

گووتم:

پێم خۆشە لەمەبەدوا باسی پەیامبەرﷺم بۆ بکەیت. کەمێک دۆش داما هەناسەیەکی قووڵی هەڵمژی هەردوو دەستی بە روخساریەوە گرت چەند ساتێک بەوجۆرە مایەوە کاتێک دەستی هێنا خوارەوە سوور هەڵگەڕابوو بە دەنگێکی حەزینەوە گووتی:

+ محمدﷺ گوڵێک بوو لە بیابانی وشکی عەرەبی سەوز بوو بۆنی بەگشت دونیادا بڵاو بۆوە هەرکەس بەدڵ بۆنی کرد باوەڕی هێنا.

کانیاوێک بوو لە بیابانی سەدان ساڵ ئاو نەدیو هەڵقووڵا تینوێتی ڕێبواری ژیانی شکاند.

خودا هیچ کەسی وەک ئەو گەورەو پیرۆز دروست نەکرد. تایبەتترینی نێوان هەموو پەیامبەران بوو، قیبلە بەخاتری ئەو گۆڕا.. چی بڵێم لەبارەی ئەو زاتە پیرۆزە؛ نازانم! هەرچی بڵێم کەمم گووتوە.

باشە.. من پرسیار دەکەم تۆ وەڵام بدەوە بەڵکو بەو شێوەیە بتوانی کەمێک لەبارەی پەیامبەریش قسەم بۆ بکەی.

+ لەوانەیە بەوجۆرە باشتر بیت بۆ هەردووکمان.

– لەبەرچی خودا لەناو ئەم هەموو مرۆڤە محمدﷺی هەڵبژارد، بۆ لە قەومی عەرەب، بۆ لە هۆزی قورەیش؟

+ پرسیارێکی زۆر کۆن و دووبارە، لە هی جووەکان دەچوو، خۆ ئەگەر کەسێکیتریش بوا هەمان پرسیاری تۆ دەهاتە گۆڕێ، بەڵام قەیدی ناکا من وەڵامت دەدەمەوە.

هەردەبوو کەسێک ببێتە پەیامبەر تاوەکو کۆی گشتی دینەکان تەواو بکات، محمدﷺ لە باوانی دایک و باوکی یەک منداڵی زینای تێدا نیە لەکاتەکدا ئەو سەردەم مندالی زینا زۆربوون، لەبەرئەوە باشترین و پاکترین کەسە بۆ پەیامبەرێتی، لەبەرئەوەش عەرەب بوو چونکە خاوەنی دەوڵەمەندترین زمانی جیهانن، هۆزەکەشی قورەیش دەسەڵاتدارو دەوڵەمەند بوون پەکیان بەکەس نەکەوتبوو.

– جیاوازی هەبوو لەگەڵ مرۆڤ؟

+ بێگومان زۆریش، ئەو تایبەندی خۆی هەبوو دڵی شۆرابوو هیچ پیسیەکی تێدا نەبوو، ئەو جیاوازیە کافیە بۆ مرۆڤی ژیر چونکە «دڵ» سەرچاوەی هەموو نیەت و کردارەکانی ژیانە.

کەمێک وەستا پاشان گووتی مرۆڤەکانی ئەو سەردەم بەڕەڵڵاو سەرلێشێواو بوون نرخی ژیانیان نەدەزانی هەموو چێژەکەیان لە دەوڵەمەندی و دەسەڵات و شەهوەتبازی کۆ کردبۆوە ببوون بە دەروێشی شەیتان تا خراپەو زوڵم هەبا لایان لەباشە نەدەکردەوە وەک

مشکە کوێرەیان لێ‌هاتبوو لەتاریکی دەژیان، کە محمدﷺ هات ئەو ژیانە تاریکەی رەت کردەوە پێی ڕاگەیاندن بەهەڵە لە ژیان حاڵی بوون چراکەی دڵی بۆ بەیانکردن کە «قورئان» بوو واقیان وڕما ترسیان لێ‌نیشت دژی وەستانەوە بۆیان قبوڵ نەکرا چونکە بە تاریکی ڕاهاتبوون تا دەهات ئەم روناکیەش پەرەی دەسەند. کافرێکی سەر بە موسەیلەمەی کەزاب بە سیاسەت لەڕێی عەتفەوە بەشێوەی ناڕاستەوخۆ کاری لەسەر دڵی خەڵک دەکرد دەیگووت: ئێمە دەزانین «محمد» درۆ دەکات بەس چی بکەین لەخۆمانە.

ئەو سیاسەتەش نەیتوانی کاری خۆی بکات دەستیان کرد بە بوختان و تۆمەت بەخشین گووتیان شێت بووە کەچی بە ئاقڵترین شێوە بۆ خەڵکی ئەدوا، ڕۆژێکیتر گووتیان ساحیرە ئەم بوختانەش وەک ئەوانیدی پووچ دەرچوو...

پیرەپیاوەکە هەوڵیدا پتر بدوێ بەڵام کات بۆ من درەنگی کردبوو پێویست بوو بگەڕێمەوە ماڵ ئیزنم لێ خواست، پاش نانی ئێوارە ئامادەکاریم کرد بۆ هاتنی میوانەکانی گەڕەک، دایکم ڕووی تێکردم گووتی: ئەوڕۆ لەگەڵ ژاڵە قسەم کرد لەسەر بیرکردنەوەی توو پرسیاری کرد داخۆ گەیشتوی بە بڕیاردان؟

کوڕەکەم لە چاوەڕوانی مەیهێڵەوە کچێکی باشە زوو بڕیار بدە با دڵی هەمومان خۆش بێت.

کەمێک گرژیمەوە گووتم: بۆ دەبێ ببمە قوربانی لە پێناو دڵخۆشی ئێوە؟

خەندەیەکی کرد گووتی: من ئامادەم، قوربانی تووبم لەپێناو یەک خولەک دڵخۆشیت.

لەگەڵ ئەو قسەیە تاسام ویستم قسەی دڵمی پێ بڵێم بانگی عیشا درا وەک ڕێزێک قسەکەمم بڕی تەواوم نەکرد، نوێژم کرد هێشتا لەسەر بەرماڵ بووم زیکرەکانی پاش نوێژم دەخوێند دایکم بەرۆکی گرتمەوە گووتی: بۆ وەڵامی ئەو کچە نادەیتەوە؟ کاتە دیاریکراوەکەش ڕەت بوو ئێستا لە ناوەڕاستی حەفتەی دووەمین. ویستم وەڵامی یەکجاری بدەمە دایکم دەنگی دەرگا بیسترا، باوکم گەش بۆوە هەڵسایە سەرپێ گووتی: پیاوانی گەڕەکن هاتوون خێرا دەرگاکە بکەنەوە.

چومە پێشوازیان دەرگام کردەوە خۆی گەیاندە هەیوان بێ شەقرە

کاتێک بەکۆمەڵ هاتنە ژوور سەلامیان کرد دەنگەکان تێکەڵ بوون بوە غەڵبە غەڵب هەر لەهەیوان باوەشیان بۆ باوکم کردەوە ماچیان کرد. دایکم فەرمووی لێکردن بچنە دیوەخان، لەوێ هەموو بەدەوری باوکم دانیشتن دەمێک بوو ئەو جۆرە دانیشتەی نەدیبوو دڵی بەخۆی سوتا دەستی بەگریان کرد هەموان دڵنەواییان کرد، بەقسەی خۆش و پێکەنین و یادی خودا شەوەکەیان لەگەڵ بەڕێکرد.

کاک سەدیق ڕەفیقی لەمێژینەی بوو قسەیەکی جوانی لەبارەی خودا کرد

+ گووتی:

بۆیە خودام خۆشدەوێ چونکە بە باشترین شێوە دروستی کردووم.

لە قورئانیش دەفەرموێ

(لقد خلقنا الانسان فی احسن تقویم) ماقوڵ نیە خۆشمنەوێ.

- گووتم:

ئەگەر دەرفەتم بدەی پرسیارێک بکەم چونکە کیشەی حاڵی نەبونم هەیە لەو ئایەتە.

+ فەرموو.

– ئەگەر بە باشترین شێوە دروست بووین، بۆ کەسانی زگماک کەمئەندام لەدایک دەبن؟ نازانم، پێم وایە لەگەل ئەم ئایەتە یەک ناگرنەوە.

+ ئەوکات ئەو پرسیارە ماقوڵ دەبوو ئەگەر خودا بیفەرمووبا:

(لقد خلقنا الانسان فی «اکمل» تقویم)

بەڵام وای نەفەرمووە، بەڵکو فەرمویەتی احسن تقویم جیاوازی هەیە لەنێوان اکمل و احسن

تۆ سەیرێکی میکانیزمی چاو بکە بەباشترین شێوە دروست کراوە برۆی لەسەرە تا ئارەقە و ئاوی نێوچەوان نەڕژێنە ناوی، برژانگی خستوەتە پێش چاو تاوەکو تۆزو خۆڵ راستەوخۆ نەڕواتە ناوی، پێلوی دروستکردوە وەک فلّچە زو زو پاکی دەکاتەوە، فرمێسکی بۆ داناوە زۆرترین سودی هەیە بۆچاو.

یا کۆئەندامی دەمار هەر دەمارێک ئەرکی خۆی بەجێ دەگەیەنێ خوێن بۆ ئەو بەشە دەگوێزتەوە کە دڵ رەوانی دەکا، دەمارێکیتر خوێنەکە دەباتەوە بۆ دڵ،

یاخود هەر ئەندامێکی دیکەی لەش ئەگەر سەیر بکەین دەبینین چەند ورد دروستکراوە ئەوسا تێ دەگەین مەبەستی خوا لە (احسن تقویم) چیە.

کاک فەرهاد، سەیرێکی منی کرد گووتی: ئێمەش سەرەتا وابووین کێشەمان زۆر بوو لە قورئان و دین حاڵی نەدەبوین

بە ناتەواومان دەزانی، کەچی کێشە لە تێگەیشتنی ئێمەبوو.

باوکم زۆر دڵی بەو دانیشتن و گفتوگۆیە خۆش بوو بارتەقای هەموو دەرمانێک سوودی پێگەیاند، لەکاتی ڕۆیشتنی میوانەکان بێ شەقرە هەڵسا لەگەڵیان چوو تا هەیوانی حەوشە، زۆر ورەبەرز بوو، گووتی:

ئەگەر بەو شێوەیە باشبم ڕەنگە بۆ نوێژی بەیانی بێمە مزگەوت لەگەڵ ئادەم.

هەموان بەو حاڵەی باوکم دڵخۆش بووین لە هەموانیش زیاتر دایکم دڵخۆش بوو خەندە لەسەر لێوانی نەدەبڕا. تا بەردەرگا لەگەڵ دراوسێکان چووم بەڕێمکردن باوکم هێشتا لەبن هەیوان وەستا بوو پشتی بەدیوارەوە دابوو دایکم بەدیاریەوە وەستا بوو قسەی بۆ دەکرد حەزم نەکرد جەوەکەیان لێ تێک بدەم بەبێ دەنگی ڕۆیشتمە ژووری خەو ماندوێتی کار و کەمخەوی وایان لێکردبووم زووم خەوم لێبکەوێ دەرفەتی بیرکردنەوەی ناو جێگەم نەبوو ئەسڵەن یادی خودام بۆ تەواو نەکرا خەو بردمیەوە. کاتێک قووڵ دەخەوتم شەش کاتژمێر خەوم بەس بوو، بۆ نوێژی بەیانی هەڵسام لەگەڵ باوکم بڕۆینە مزگەوت سەرەتا بانگی دایکم کرد ئەو لە بانگکردن و واگاهێنانی باوکم شارەزا بوو نەرم واگایدێنا. تا دەستنوێژم هەڵگرت باوکم هێشتا خەو بەری نەدابوو هیچ وەڵامێکی نەبوو گووتم: لێیگەڕێ دایکە با تێر خەو بێت من دەڕۆم.

دایکم مشەوەش بوو گووتی: دەڕۆیتە کوێ؟ باوکت پێ ناچێ خەوتبێ! خێرا لەدەرگای ئەو دراوسێیانە بدە بێن لەگەڵمان تا نەخۆشخانەی بەرین، دەستێکم گەیاندە نێوچەوانی جەستەی سارد بوو ڕەنگی زەرد هەڵگەڕابوو گوێم بە سنگیەوە نا هیچ ترپەیەکم لە دڵیەوە نەبیست تاسام دەمێک بەدیاریەوە رەق بووم نەمدەزانی دەبێ چبکەم! دایکم وەک کێو لەپشتم وەستا دەستی خستە سەرشانم گووتی:

تەنها ئارامگرە، بەخێرایی لەگەڵ دراوسێکان بردمانە نەخۆشخانە لەوێ بیرم کەوتەوە پەیوەندی بە ژاڵەی پەرستارەوە بکەم بیرۆکەکەم بە دایکم گووت پێی باش نەبوو گووتی: ڕەنگە ئەوشەو دەوامی نەبیت و لەماڵ بێ. گوێم بە قسەکەی نەدا پەیوەندیم پێوەکرد لەگەڵ یەکەم زەنگ هەڵیگرت بێ ئەوەی سڵاو بکەم یا خۆم بناسێنم یەکەوراست گووتم: باوکم حاڵی تێک چووە نازانین مردوە یا نا خێرا فریامان کەوە.

گووتی: ئادەم ئەوە تۆی؟

بە قوڕگی پڕ گریانەوە گووتم: بەڵێ.

گووتی: پەیوەندیەکە بدە دایکت دەمەوێ قسەی لەگەڵ بکەم.

نازانم لەگەڵ دایکم باسی چیان کرد تەنها بینیم دایکم بەگریانەوە قسەی لەگەڵ کرد، نیو کاتژمێر بەسەر دۆخی باوکم تێپەڕی نەمزانی چۆن نوێژی بەیانیم کرد پزیشکەکانیش هیچ هەواڵێکیان نەداینێ، ژاڵە هات باوەشی بەدایکمدا کرد گووتی: قسەم لەگەڵ پزیشکەکان کردوە کەمێکیتر دێن قسەتان بۆ دەکەن.

دایکم ڕووی تێکردم گووتی: تا پزیشک دێن هەواڵ بە خوشک و براکانت بدە، هەمان سیناریۆی سەرەتای نەخۆشکەوتنی باوکم دووبارە بۆوە بەڵام ئەوجارە ئەنجامەکەی جیاواز بوو چونکە کاتێک پزیشکەکە هات قسەی بۆ کردین گووتی: مادەم لەدایک بوونێک هەیە دەبێ مردنێکیش هەبێت ئەوە یاسای خودایە! ئەم دێرە موچڕکێکی دا بەگیانم.. شل بووم هەستم دەکرد ئێسکە پەیکەری جەستەم دەرهێنراوە نەمدەتوانی لەسەر قاچەکانم بوەستم سەیری خوشکو براکانم دەکرد دەگریان بەڵام گریانیان لە ڕاستی نەدەچوو لەو سیناریۆیە دەچوو کەوا

ئەکتەرەکان لەبەرچاوی کامیرا فرمێسکیان دەڕشت بۆ فریودانی بینەر! لەبەرامبەر بڕێک پارە. ئەوانەش بۆ میرات دەگریان نەک مەرگی باوکم.

دوای شۆردن و کفنکردن و بۆنخۆشکردنی، نوێژی مردوومان لەسەر کرد لە مزگەوتی کۆڵانەکەی خۆمان زیاتر لە چوارسەد کەس نوێژیان لەسەر کرد لەسەر قەبرانیش مامۆستای مزگەوت لەسەر چەند بلۆکێک وەستا وەک مینبەرێک وابوو وتارێکی دا گووتی:

ئەی کۆمەڵی موسڵمانان مردن کۆتایی ژیان نیە بەڵکو ئامادەبوونە بۆ ژیانێکیتر ئەم گۆڕەی ئێستا دەیبینن لەپێش چاوتانە لە سکی دایک دەچێ! وەک چۆن ئێمە کە هاتین بۆ سەر زەوی بە سکی دایکماندا تێپەڕین و گەیشتین بێرە،

بۆ ژیانی ئەم دیویش دەبێ بەم گۆڕە تێپەڕین، سوپاسی خودا بکەن گۆڕەکەتان گەدەی باڵندەو ئاژەڵی دڕندەو ژێر دەریا و بنی زیلەمۆ نیە.. لە کۆتایی وتارەکەش گووتی: هەبوونی گوڕێک فایدەی چیە ئەگەر هەگبەتان بەتاڵ بێت؟ با گۆڕتان گەدەی باڵندەیەک بێت بەس هەگبەتان پڕ بێت چونکە سەرمایەیە بۆ ژیانی ئەو دیو.

برا گەورەکەم بەگوێی مامۆستای چپاند کەوا تازیە دانانێین کەس بەناوی تازیە سەردانمان نەکات، مەراسیمی بەخاک سپاردن کۆتایی هات هەرکەس گەڕاوە ماڵی خۆی ئێمەش هەر حەفتەی یەکەم میوانن دەهات هەرکەس سەرقاڵی ژیانی خۆی بوو تەنانەت خوشک و براکانیشم ئێمەیان جێ هێشت.

شەوانە دایکم بەدەم خەتمی قورئانەوە فرمێسک لەچاوەکانی دەڕژانە سەر روومەت و جۆگەڵەی دەبەست بۆسەر چەناگەی بەردەبۆوە کۆشی. کاتەک پرسیارم لێدەکرد وەڵامی نەئەدامەوە تا دەگەیشتە کۆتا ئایەت ئەوسا سەیری دەکردم و دەیگووت:

+ دەزانی باوکت چەند ئەو ماڵەی چۆڵ کرد یا ئەتۆش وەک خوشکو برا سپڵەکانت هەست بە بۆشایی و نەبوونی باوکت ناکەی؟

توند باوەشم پیدا گرت گووتم:

هەموو کات لەسەر ئامۆژگاریەکانی تۆ کە پێت دەگووتم:

– تەنها ئارام گرتن دەتباتە کەناری سەرکەوتن، ئارامم گرتوە لەسەر ئەو نەهامەتیەی توشمان بووە گەیشتوم بەو کەنارەی بەهۆی ئارامیەوە دەستم کەوت.

دەزانی دایکە گیان نهێنی ئارامگرتن لەچی دایە؟

بەچاوە پڕ فرمسێک و قوڕگە پڕ گریانەی گووتی:

+ نـــازانم، ئێستا هیچم بیر نیە.

– دەی با من بە دایکە جوانەکەی خۆم بڵێم کەوا ئارامگرتن کلیلی دەرگای داخراوەکانە یادکردنی خواش ددانی ئەم کلیلەن.

ئارامگری وەڵامی ئەو پرسیارانەیە کەوا هێشتا نەکراون.

لەهەمووی گرنگتر عیبادەتە.

بۆیە لەسەر ئەو بەڵایەی توشمان هاتووە ئارامبگرە خودا یارمەتیت دەدا. بۆ ئەوەی لەو دۆخە دەربازی بکەم هەندێک بیری بەلای خوداو پەیامبەر ببەم گووتم: لەبری ئەوەی لە بیری باوکم دابیت بیر لەخودا بکەوە لە دینو پەیامبەرەکەی وردبەوە.

ئەها ببینە قەت بیرت لەوە کردۆتەوە پیاوێک لە بیابان هات، گووتی: من نێردراوی خودام؟ پرسیارت لەخۆت کرد حیکمەتی ئەوە لەچی

دایە کەوا خودا بۆچی لە بیابانی وشک و گەرم پەیامبەری نارد بۆ مرۆڤایەتی؟

+ نـــا، قەت بیرم لەوە نەکردبۆوە.

– لەو ناوچە گەرمەسێرە زۆرترین خوای دەسکردی مرۆڤەکان هەبوو، لەناوبردنیان پێویستی بەکەسێک بوو لەخودی خۆیان بێت بتوانێ هەڵبکات لەگەڵ گەرمای بیابانی وشک و کەم ئاوەزی خەڵکی ناوچەکە.

تاقی کردنەوەشە بۆ موسڵمانەکان.

+ تاقی کردنەوە! یانی چۆن.. تێناگەم؟ هەڵبژاردنی پەیامبەر لە بیابان چی پەیوەندی بە تاقی کردنەوەی موسڵمانەکانەوە هەیە!.

– چۆن پەیوەندی نیە! ئەتۆی موسڵمان لەم کەشوهەوا فێنک و خۆشە دەرۆیتە ئەم بیابانە گەرمە سەردانی مالی خوداو مزگەوتی پەیامبەر دەکەی بۆ ئەوەی خۆراک بە رۆحت بدەی ئەو گەرمایە دەچێژی، ئەوە خودی تاقی کردنەوەی ئیمانەکەیە.

+ دروستە ئێمە لەبەر خودا ئەو گەرمیە تاقەت پڕوکێنە دەچێژین دڵمان پێ دەکرێتەوە ئاسودەیی دەگەڕێ بە دەرونمان.. شوێنێکی پیرۆزە ئاسایی نیە؛ یانی بەڕای تۆ خودا بۆ تاقی کردنەوەی ئیمانداران ئەو بیابانەی کردە ماڵی خۆی، پەیامبەری لەوێ هەڵبژارد؟

– ئەوەی باسم کرد تەنیا کەمینەیەکە لەو حیکمەتە زۆرەی کەوا هێشتا مرۆڤایەتی درکی پێ نەکردوە هەر سەردەمەو حیکمەتێکی نوێ دێتە گۆڕێ.

+ پرسیارێکی دیم هەیە هەرچەند گومانیشم هەیە لەوانەیە لەسەرم بە گوناه بنوسرێ! دەمێکە وەڵامەکەیم چنگ نەکەوتووە، نازانم بیکەم یا نــا.

– هیچ پرسیارێک گوناه نیە ئەگەر نیەتت تەنها وەچنگ کەوتنی زانیاری بێت.

+ باشە، بۆچی پەیامبەر لەگەڵ هاوەڵانی ڕێیان لە بازرگانی خەڵکی مەککە دەگرت و تاڵانیان دەکردن؟ کاتەک لە مەدینە بوون.

– پەیامبەرو هاوەڵانی دەرکران لەلایەن کافرانی مەککەوە دەستیش بەسەر ماڵ و سامانیان داگیرا ئەزیەتی زۆریشیان درا. کاتەک خەڵکی مەدینە پشتیوانیان کردن و خودا هێزی پێ بەخشین، بۆئەوەی چیدی نەبنە بار بۆ خەڵکی مەدینە هەڵسان ڕێگای بازرگانی خەڵکی مەککەیان گرت و سەروەت و ماڵی خۆیان لێ دەسەندنەوە و بەشی خەڵکی مەدینەشیان لێ دەدا.

+ باسی کەسایەتی پەیامبەرم بۆ بکە دەمەوێ لەزاری تۆ ببیستم بزانم چۆن باسی دەکەی.

– دایکە گیان بەخوا پەیامبەر زۆر لەوە گەورەترە ئێمە بەو ناخە پیس و زمانە شڕەوە باسی بکەین.

+ وامەڵێ کوڕەکەم، مرۆڤەکان ناخیان پیس نیە و زمانیشیان شڕ نیە هەموویان پاکن تەنها ئەوانە نەبێ دوای شەیتان کەوتون، ئێستا واز لەوان بێنین تۆ باسی پەیامبەر بکە.

– باشە، بە وردی گوێم بۆ ڕاگرە.

پیاوێک بوو لەبیابان توانی سەرەنجی خەڵکی بەلای خۆیدا ڕابکێشێ بەهۆی ڕاستگۆیی و ژیری و ڕەوشت بەرزیەکەی، ئەم چەند سیفەتەی بەس بوو بۆ ئەوەی کەسایەتیەکی تایبەتی پێ ببەخشێ، هەمووان باوەڕی تەواویان پێی هەبوو تا ئەو ڕۆژەی فەرمووی: من نێردراوی خودام! لەو ڕۆژەوە هەمووان دژی وەستانەوە نەیاندەتوانی بڵێن درۆ دەکا بەڵکو گووتیان: شێت بووە.

ژیریەکەی وایکرد لە کەسایەتیە گەورەکان دەست پێبکا بۆ ئەوەی باوەڕی پێ بکەن ببن بە ئیسلام گەورە بازرگان و ڕاستگۆی مەککە ئەبوبەکری سەدیق یەکێک بوو لەوانەی زوو باوەڕی هێنا، پاشان پیاوە بەشەرم و ئابڕووەکەی شار عوسمانی کوڕی عەفان هاتە ڕیزی باوەڕداران.

پرسیاری دیکە دێتە گۆڕێ!

بۆچی لەسەرەتا ئەم کەسایەتیە گەورانەی هەڵبژارد؟

وەڵامەکەی ئاشکرایە کەوا ئەوانە کاریگەری تەواویان لەسەر خەڵکی هەبوو لەبەر رەوشتی بەرزو پێگەی کۆمەڵایەتیان کەوا بووە هۆکاری زووتر بڵاوبونەوەو باوەڕ هێنان بە محمدﷺ لەلایەن ئەوانیترەوە.

دایکم بزەیەکی کرد گووتی:

+ قسەی زۆرت لەبارەی پەیامبەرﷺ کرد با منیش قسەیەک بکەم لەسەر زاتە پیرۆزە.

– هەموو خەڵکی دنیا کۆبێتەوە ناتوانن شتێکی لایەق بەرامبەر بە محمدﷺ بنووسن چ جای منێکی شڕۆڵ و کاڵفام، بەڵام تۆ بفەرموو شتێک بڵێ دایکەگیان.

+ ئۆکسجین چەندە پێویستە بۆ کەسێک لەبنی دەریا گیری خواردبێ هەوای دەست نەکەوێ بۆ سییەکانی؟ ئەم گەردوونەش لەوە پتر پێویستی بە محمدﷺ هەبوو، خودا فەزڵی بە مرۆڤایەتی کرد ئەو زاتەی بۆ ناردوە.

بەوجۆرە شەومان بەڕێکرد ڕۆژانەش تاوەکو لەکار دەگەڕامەوە ئەو تەنها بوو هەستی بە تەنهایی دەکرد دوو مانگ بەسەر ئەو دۆخەدا ڕەت بوو خەریک بوو بڕۆینە داوای پەرستار ژاڵە، بەلام خوشکو براکانم داوای میراتیان کرد ناچار بووین خانوەکە بفرۆشین بەر لە هەموو شتێک دایکم گووتی: بەشی منو ئادەم جیا بکەنەوە، لەگەڵ ئەو زێڕەی هەیبوو منیش کەمێک پارەی پاشەکەوتم هەبوو کۆمان کردەوە توانیمان خانوێکی بچوک و تازە بکڕین مانگێکیش بەسەر ئەو دۆخە تێپەڕی دنیا ساردی کرد بەرەو وەرزی زستان دەچووین.

دایکم خوازبێنی ژاڵەی بۆ کردم لە شەوێکی ساردی باراناوی مارەبڕ کراین شەکراو خورایەوە وێنەو پیرۆزبایی کۆتایی هات گەڕاینەوە ماڵ ماندوێتی بڕستی لێ بڕیبووم هەر بەجلی زاواییەوە خەوتم بەیانی ڕۆژی هەینی بوو درەنگ هەڵسام وەک هەمیشە یەکەم کارم سوپاس و ستایشی خوابوو کەوا ئەمڕۆشی بەدیاری پێ بەخشیوم سەیرێکی مۆبیلم کرد خەتی نێتم کردەوە نامەکانی ژاڵە دەنگیان بەرز بۆوە پاش خوێندنەوە، وەلامم دایەوە کەوا پاش نیوەڕۆ خۆی حازر بکات دەڕۆینە پیاسە.

سەردانی کافیتریای خێزانیمان کرد گارسۆنەکە هات پرسی چی دەخۆن؟ چونکە دەرەوە سارد بوو ژاڵە داوای دوو کوپ شیری گەرم و بێ شەکری کرد.

وامزانی وەک هەموو خەلکیتر ئاسایی لە دەسگیرانی باسی ناومال و مندالو ناونانی یەکەم مندال دەکات، بەلام وانەبوو یەکەوڕاست چووە سەرباسی ئاین گووتی:

+ لە ئیسلام دا

دەستوریکی نەگۆڕ هەیە کە قورئانە.

یاسایەکی جێگیر هەیە فەرموودەو سوننەتە.

ڕێسایەکیش هەیە فەتوای زاناکانن ئەویش بەپێی کات و شوێن گۆڕێنکاری تیدا دەکرێ.

– بوەستە، پێش ئەوەی باسی ئیسلامم بۆ بکەی دەمەوێ بزانم چۆنە ئاوا لەپڕ گۆڕای؟ بویت بە موسڵمانێکی تەواو پەیوەست.

+ تۆ واز لەوە بێنە، وەڵامەکەی هەڵدەگرین بۆ داهاتوو.

– زۆر باشە، کەوایە سەرەتا دەربارەی محمدﷺ قسەم بۆ بکە.

+ باش، گەورەیی پەیامبەر لەوەسفی ئێمەی موسڵماندا دەگەڕێتەوە بۆ دوو هۆکار یەکەمیان: لەبەرئەوەی هەڵبژێردراوی خودایە، واتە ناچارین بە مەزن ئەو ببینین و لەخۆمان بە پیرۆزتری بزانین.

دووەم: کەسایەتی خودی پەیامبەرە، واتە: پێش ئەوەی وەحی بۆ بێت خاوەن کەسایەتیەکی بەڕێز بوو، هیچ خراپەیەکی نەبوو ڕاستگۆ و داوێن پاک بوو ئارەقخۆر نەبوو (دوور لەئەو) لەکاتەکدا سەردەمەکە پڕبوو لە خراپەکاری.

لە جەنگەکاندا دیلی کافرەکانی دەپاراست خزمەتی دەکردن بەرامبەر شتێکی رەمزی ئازادی دەکردن.

- هەر بەڕاست لەدڵم بوە مەرەق بۆچی نەیدەکوشتن؟ چ ئاتاج بەو پێدانە ڕەمزیە بوو!

+ ئەو هیچی بۆخۆی وەرنەدەگرت بەڵکو بۆ موسڵمانەکان بوو، کۆمەڵێک دیلی ئازاد کرد بەرامبەر فێرکردنی خوێندن و نوسین، دەیتوانی بەزۆر وایان لێبکات مامۆستایی بۆ منداڵە موسڵمانەکان بکەن و دواتریش بیانکوژێت یا بەرامبەر پارەیەکی زۆر ئەوسا ئازادیان بکات، بەڵام نەیکرد.

- بۆچی؟

+ ئەو ڕەحمەتە بۆ جیهانیان نەک بکوژی جیهانیان!

دیلەکانیش لە ئوممەتی ئەون دەکرێ هیدایەت وەرگرن و ببن بە موسڵمان، کوشتنیان هیچ سودێکی بۆ ئیسلام نیە، بەڵکو ئازاد کردنیان بە سودترە! سەرنجکێش کردنی کافرانە، لە نیشاندانی ئەو ڕەوشتە بەرزەی پەیڕەو دەکرا لەلایەن محمدﷺ دەبووە هۆی باوەڕهێنانی هەندێک لە بێباوەڕان.

لەگەڵ بیستنی شکانی کوپێک چایی لە مێزەکەی بەرامبەرمان کەوا ئافرەتێکی بەتەمەنی لەرزۆک لەدەستی کەوتە خوارەوە ڕاچڵەکین و لەگفتوگۆ دابڕاین گارسۆنەکە زۆر بە ئەدەبەوە بەدەم ئافرەتەکەوە هات داوای لێبوردنی لێکرد پێی گووت کەوا چاییەکە زۆر گەرم بوو بۆیە لەدەستت کەوت و ڕژا ئێستا بۆت قەرەبوو دەکەمەوە خێرا ڕۆیی چاییەکی‌دی بۆ هێنا بەرامبەری دانیشت بەدەستەکانی خۆی کوپەکەی بەدەمەوە دەکرد.

زۆر پێی سەرسام بووم ڕووم لە ژاڵە کرد پێم گووت: پێم خۆشە لەو گارسۆنە بپرسم بۆ ئەوەندە میهرەبانی نواند بەرامبەر ئەو ئافرەتە.

بزەیەکی کرد گووتی: چەند فزوڵی حەزدەکەی هەموو شتیک بزانی، دەستی بە پیکەنین کرد.

دانیشتین هەر چاوەڕێ بووین ئافرەتە پیرەکە بڕوات تا پرسیار لە گارسۆنەکە بکەم، لەبەختی ئێمە نیوکاتژمێر دواکەوتین، لەکاتی پێدانی پارە بە گارسۆنەکەم گووت:

- دەکرێ بپرسم چی شتێک وای لێکردی بەوجۆرە رەفتار بنوێنی لەگەڵ ئەم ئافرەتە بەتەمەنە؟

ئانیشکی خستە سەر مێزە درێژەکەی بەردەمی و دەستی خستە سەر دەمی کەمێک تێم ڕاما گووتی:

+ موسڵمانێتیم وای پەروەردە کردووم ڕێزی گەورەتر لەخۆم بگرم، ئیمڕۆ من ئەدەبێکم چاند لە داهاتوو بەرهەمەکەی دەخۆم، لە ڕووی مرۆڤایەتیەوەش پێم خۆش نەبوو هەست بە کەمی و لاوازی بکات بەسەرخۆیدا بشکێتەوە شکانی کوپەکەم خستە ئەستۆی خۆم.

ئەم ئافرەتە بیست ساڵ دەبێت بەردەوام سەردانمان دەکات پێشتر لەگەڵ هاوسەرەکەی دەهات کەوا زۆر هاوڕێی باوکم بوو چەند ساڵێک دەبێ هەردووکیان مردوون کاتێک منداڵ بووم کوپێک قاوەم شکاند باوکم ویستی لێم تورە بێت ئەو ئافرەتە فریام کەوت گووتی: من قەرەبویەکە دەدەم بەس هیچ بەو منداڵە نەڵێی تا بەسەرخۆیدا نەشکێتەوە..

دەستی دۆقەم بۆ درێژ کرد نزای سەرکەوتنی زیاترم بۆکرد.

لەگەڵ ژاڵە ڕێی ماڵمان گرتەبەر کۆتا قسەی گووتی: کەی ئاهەنگ بگێڕین جلی سپی بپۆشم؟

گووتم: ئەم حەفتەیە مۆڵەتم بدە ئامادەکاری بکەم، ڕۆژانی دواتر کاتێک دیاری دەکەین.

گەیشتینە بەردەم دەرگەی ماڵیان ساتی ماڵئاوایی بوو دەستی دۆقەی بۆ درێژ کردم، بڕیار نەبوو دەستمان بەریەک بکەوێ، گووتم:

باپەند دەبم بە بەڵێنەکەمان نامەوێ دەستم لە دەستت بدەم خەندەیەکم بە ڕووی‌دا کرد ئەوسا لێک جیابووینەوە.

بانگی مەغریب نزیکی کردبوو نویژم لە مزگەوتی گەڕەکی ئەوان کرد، ملی ڕێگام گرتەبەر بەدەم یادی خواوە هەنگاوم هەڵدێنا پێم وابوو کات وەستاوە زووتر لەو ماوەی دامنابوو گەیشتمەوە ماڵ دایکم لەسەر دووگرد بوو تەسبیحی بەدەستەوە بوو خەریکی تەسبیحات بوو سڵاوم کرد ئاوڕێکی لێدامەوە روخسارە گەشەکەی دەتگووت گڵۆپە دەدروشێتەوە بزەیەکی کرد وەڵامی سڵاوەکەی گەرمتر دامەوە گووتی: نانت خواردووە؟

- نـا

+ منیش نەمخواردوە چاوەڕێ بووم بێیتەوە لەگەڵ تۆ پارویەک بخۆم، بێ تۆ نان لەقورگم ناچێتە خوار.

بەیەکەوە خوانەکەمان ئامادە کرد هەستم کرد دایکم زۆر برسیەتی پێم گووت:

- بۆچی زووتر نانت نەخوارد هیچ نەبا پارویەکت خواردبا کاتەک منیش دەهاتمەوە پێکەوە دادەنیشتین نانمان دەخوارد.

+ ئەی ناڵێم پێم نەخورا، بەهیچ جۆرێک بیریشم لەوە نەکردەوە بەلای مەنجەڵی شیوەکەدا بڕۆم چونکە تۆ لێرە نەبووی کوڕەکەم.

لەگەڵ ئەم هەست و سۆزو میهرەبانیەی دایکم دەمم ڕەق بوو زمانم وەستا سڕبووم بیرم بۆ ئەوە چوو دایکێک ئەوەندە میهرەبان بێت نان نەخوات تا لەگەڵ ڕۆڵەکەی نەبێت، ئەی میهرەبانی خودا دەبێ چەند بێ! سۆزو بەزەیی چەندە فرەوان بێت؟

نوێژی عیشام لەماڵ کرد، بەدەم چایی خواردنەوە بەدایکمم گووت: ئامادەکاری بکەن لەگەڵ خوشک و براکانم، حەفتەی داهاتوش ڕۆژێک بە هاوبەشی لەگەڵ ژاڵە دیاری دەکەین بۆ ئاهەنگی گواستنەوە.

کات تێپەڕی ئاهەنگمان سازکرد هەینیەک بەسەر هاوسەرگیریماندا ڕەت بوو دایکم بەردەوام ماڵی جێدەهێشت سەردانی ماڵی خوشک و براکانمی دەکرد شەویش لایان دەمایەوە، هەرکات پەیوەندیم پێوە دەکرد داوام لێدەکرد بگەڕێتەوە، پێدەکەنی دەیگووت: با ئەم حەفتەیەش تەنهابن دواتر دێمەوە. بەگاڵتەوە گووتم: بەخۆت بێیتەوە باشترە نەک دەرتکەن.

ڕۆژان تێپەڕین ژاڵە مۆڵەتی تەواو بوو گەڕایەوە نەخۆشخانە منیش چوومەوە سەرکار دایکم هاتەوە ماڵ ئێواران بەدەوری یەک دادەنیشتین سەرەتای خوانەکەمان بەرەکەتدار دەکرد بە ناوی خودا دەستمان بە نانخواردن دەکرد.

هەستم دەکرد کەسایەتیم گۆڕا بوو، خەڵکی جۆرێکیتر لەمنیان دەڕوانی ئەو گەنجە سەڵتەی جاران نەمابووم حسێبی پیاوم بۆ دەکرا لەگەڕەک و لای دراوسێکان بە ماڵی کاک ئادەم ناسرابووین  هەمیشە دایکم ئەجری هاوسێیەتی لەگەڵیان بەجێ دەگەیاند خواردنی لەگەڵ دەگۆڕینەوە لە بچوکترین کێشە بەدەمیانەوە دەچوو هاوکاری زۆری دەکردن بەیانیەکی زوو ژنی دراوسێکەمان منداڵی دەبوو لای مایەوە

خزمەتی منداڵەکانی کرد چێشتی بۆ حازر کردن لە ئێوارەی ئەو ڕۆژەدا لەگەڵ ژاڵە بوو بەشەڕمان! هاتەوە لەبەردەم دەرگای ژوور وەستا منی بینی ڕووم گرژە و بەتەنها دانیشتووم، گووتی: ئادەم، کوا ئەو پەرستارەی خزمەتی باوکتی کرد؟

بەو قسەیە شەرم دایگرتم بەدلێکی پڕ ئیحراجەوە گووتم: چۆتە ئەو دیو. جێی هێشتم.

هەمان ڕووداوی پەیامبەرﷺ هاتەوە یادم کاتێک سەردانی ماڵی فاتیمەی کچی کرد (د.خ) بینی روخساری ئاسایی نیە لەگەڵ امامی علی(د.خ) شەڕیان بووە پێی فەرموو ئەی فاتیمە کوا کوڕی مامت!

گەورەیی پەیامبەرﷺ لەوەدایە فەزڵی خزمایەتی نیشانی کچەکەی دەدات تاوەکو سارد بێتەوە...

دایکیشم هەمان ڕەفتارو دانایی پەیامبەرﷺی بەرامبەر من بەکار هێنا سەرکەوتوش بوو دڵی کردم بە ئاو شەرم دایگرتم کەوا چۆن لە کەسێکی وا توڕە بووم کەوا چاکەی زۆری بەسەرمەوە هەبووە.

لەشوێنی خۆم هەڵسام بڕۆمە ئەو دیو تەقەم لەدەرگاوە هێنا چاوەڕێ ئیزنم کرد فەرمووم لێبکرێ، بەڵام هیچم نەبیست جارێکیتریش دووبارەم کردەوە فایدەی نەبوو جاری سێهەم لەدەرگام نەدا ڕووم وەرگێڕا بەدڵ ساردی بچمەوە شوێنی خۆم دایکم دەنگی بەرز کردوە فەرموی لێکردم دەسکی دەرگاکەم گرت پاڵم پێوەنا بینیم لە تەک ژاڵەیە لەباوەشی گرتوە دەست بە پشتی دادێنێ دەی لاوێنێتەوە دیمەنەکەم زۆر بەلاوە جوان بوو خێرا هەردووکیانم بەیەکەوە لەئامێز گرت داوای لێبوردنم کرد وەک قەرەبوی ئەم دلگرانیەی ژاڵە بڕیامدا هەرچی داوای بکات بەپێی توانا بۆی وەدی دێنم.

پێم وابوو داوای دەستەجلێک یا ئەوپەڕی مستیلەیەکی زێڕ دەکات بەڵام لەو بۆچوونەدا هەڵەبووم چونکە داوای ئۆتۆمبێلی کرد! پارەکی واشم نەبوو ئەو داوایەی بۆ وەئەنجام بگەیەنم متەقم نەکرد دایکم گووتی: بەدڵنیاییەوە دەیکڕین زۆر پێویستمان بە ئۆتۆمبێل هەیە.

سەیرێکی دایکم کرد بە زمانی چاو پێم گووت: ئەو پارەیە لەکوێ بێنین!

خەندەیەکی بۆ کردم گووتی: زێڕی دەستی خۆم دەفرۆشین ئەگەر کەمی کرد دەڕۆمە لای خاڵۆت قەرزی لێدەکەین. ژاڵە بەو قەرزەی لەدەمی دایکم هاتە دەر شۆک بوو گووتی: ئەو زێڕەی لەدەست و ملی مندا هەیە بۆچی باشە ئەگەر نەتوانرێ سودی لێوەرگرین.

لەکۆتایی بووین بەخاوەنی ئۆتۆمبێل زو زو گەشتمان دەکرد دەڕۆیشتین بۆ پیاسەو گەڕانی دوور، تاقە شتێک دایکم لەدڵی گرتبوو نەیدەتوانی بەئاسانی بۆمانی دەربڕێ نەبوونی منداڵ بوو بەشێوەی ناراستەوخۆ جاروبار دەیگووت: منداڵ ئاوەدانیە.

ژاڵە بە پێکەنینەوە دەیگووت ئێستا دوو منداڵ لەدەوری تۆن(مەبەستی خۆی بوو لەگەڵ من).

دایکم هەناسەیەکی ساردی هەڵدەمژی دەیگووت: دەمەوێ بەر لە مردنم مندالی ئێوە ببینم، ئەوە تاقە ئاواتی منە دوای هەر نوێژێک نزای وەدی هاتنی دەکەم.

هەر لەوێ لەسەر دەستی دایکم بڕیارماندا ئەگەر خودا بەقسمەتی کردین ماڵ بۆ دایکم ئاوەدان بکەینەوە بەو نیعمەتەی خودا بە بەندەکانی دەبەخشێ کە منداڵە.

ئێوارەی ڕۆژی دواتر لەسەرکار دەهاتمەوە زۆر ماندوو بووم حەزم کرد پشوو بدەم ژاڵە سەری خستە سەر سنگم گووتی: چیە دەڵێی پەیامبەرتﷺ بیر چۆتەوە! هەست بە ترپەی دڵت ناکەم بۆ دیداری ئەو لێبدا.

شۆک بووم موچڕک گیانی تەنیم مووی جەستەم رەق وەستان هەناسەم تەنگ و زمانم لاڵ، خەریک بوو حاڵ بگرم، هەستێکم بۆ دروست ببوو هەرگیز ناتوانم لە ناو وشەدا جێی بکەمەوە بیخەمە ڕیزی ڕستە جوانەکانی نێو کتێبان!

ژاڵە هەستی کرد حاڵم تێک چووە قسەکانی کاریگەر بوونە لەسەرم تەنگاو بوو نەیدەزانی چۆن ئاساییم بکاتەوە باسی هەر شتێکی دەکرد زیاتر حاڵم تێک دەچوو کۆتاجار ناوی پەیامبەریﷺ هینا بزەیەکم کرد تێم گەیاند ئەوە دەرمانی حاڵی منە.

هەناسەیەکی قوڵی هەڵمژی ئاسودەییەک بە دڵ و دەروونیدا گەڕا گووتی:

هەموو پەیامبەران بۆ ڕاستەڕێ کردنی مرۆڤایەتی پەیامیان هێنابوو مرۆڤیان لە کیویەتی و ژیانی سەرەتایی دەرباز کرد وایان کرد مرۆڤ پیرۆزی خۆی هەست پێبکا و لەو دۆخە سەرەتاییە بێنە دەر، بەڵام کاتێک محمدﷺ هات وەک دواهەمین پەیامبەر مرۆڤایەتی لە پێشکەوتنی ئەقڵیەت دابوو ئامادەبوو بۆ وەرگرتنی بەرنامەی نوێی ژیان کە بریتی بوو لە «رەوشت» ئاینی ئیسلامی پێ ئاشنا کردن نەریتی مرۆڤی گۆڕی بۆ ئاستێکی بەرزی ژیانکردن، فێری کردن کچ مایەی شەرمەندەیی نیە زیندە بەچاڵکردنی هەڵوەشاندەوە، ئافرەت تەنها بۆ لەزەتی پیاو نیە شکۆو ڕێزی بۆ گەڕاندنەوە، سورەتێکی بەناوی «النساء» بەوەحی بۆ

هات کەوا سەنەدێکە بۆ ئافرەتان تا مرۆڤانە مامەڵەیان لەگەڵدا بکرێت لەهەندێ کاروباردا پرسیان پێ بکرێت ڕەئیان وەربگیرێت.

حاڵم باشتر بوو گووتم:

– بوەستە، لەبەرچی هەر باسی گەورەیی ئافرەت دەکەی! ئەی پیاوان هیچ پیرۆزیەکیان نیە وا فەرامۆشت کردوون وشەیەکیش دەربارەی ئەوان بەزارتدا نایە؟

+ چۆن باسی پیاوم نەکردوە! تۆ کەمێک بیر لە قسەکانم بکەوە ئەوسا دەزانی چەند باسی پیاوم کردوە.

کەمێک دامام بیرم لە وشەکانی کردەوە واقم وڕما! گووتم:

– یانی پیاو دڕندەن؟

لە ترقژنیدا پێکەنی باوەشی پێدا کردم توووند گوشیمی ماچی کردم، گووتی:

+ ئەگەر هەبوونی کچ ببێتە مایەی سەرشۆڕی پیاو، وەک مرۆڤ سەیرنەکرێن و زیندە بەچاڵ عاقیبەتیان بێت ئەوانەو هیتریش دڕندەیی نەبێت! بەڕای تۆ دڕندەیی چیە؟

دەمم بوو بەتەڵەی تەقیو هیچم بۆ نەگووترا، لێم دوور کەوتەوە هەڵسا دەرگەی ساردکەرەوەکەی کردەوە هەندێ میوەی دەرهێنا خستیە بەردەمم بەدەستەکانی خۆی دەیخستە دەمم پاشان گووتی: پیاوان هەموو دڕندە نین خۆشەویسترین و نزیکترین کەس لە پەیامبەر ابوبکر بوو، جێ نشینەکانی پیاو بوون رەفتارو مامەڵەی ڕۆژانەی لەگەڵ هاوەڵان بوو زۆرینەیان پیاو بوون، کاتێ کۆچی کرد بۆ مەدینە تاکە هاوەڵ لەگەڵی ڕۆیشت پیاو بوو.. ئەوانە بۆتۆ کافی نین لە پیرۆزی پیاو بەلای پەیامبەرﷺ؟

خەندەیەکم کرد بەگاڵتەوە گووتم: ئێستا وەک دڕندەیەک پەلامارت ئەدەم لەگەڵ میوەدا ئەتخۆم.

بەرەو دواوە کشایەوە پێی گیربوو بەپشتدا کەوت سەری بەر کۆمەد کەوت؛ بورایەوە! بەخێرایی لەگەڵ دایکم گەیاندمانە نەخۆشخانە هاوڕێ پەرستارەکانی لەدەوری کۆبونەوە بەخێرایی تیشکی سەریان گرت پزیشکی تایبەت هات کۆمەڵێک پشکینی سەرەتایی بۆکرد هیچی وای بۆ دەرنەکەوت، بردیان بۆ ژورێکیتر ئێمەیان جیاکردەوە بردیانین بۆ هۆڵی چاوەڕوانی کاتژمێرێک لەوێدا ماینەوە پەرستارەکان زۆر شپرزە بوون هاتوچویان دەکرد. دایکم بە تەسبیحەکەی هەر خەریکی نزاو سەلاواتدان بوو.. ئەو جۆرە ڕووداوانەم زۆر لە فلمو کتێبەکاندا کەوتبووە بەرچاو لەو حاڵەتە ئافرەتەکە هەواڵی دووگیان بوونی دەدەرێ بە کەسوکاری لەبەرئەوە زۆر شپرزە نەبووم چاوەرێی هەواڵەکە بووم. لەکۆتایی پزیشکی پسپۆڕ هات بەشێوەیەک قسەی دەکرد دڵم کەوتە خورپە گووتم: خێرا پێم بڵێ چی بووە؟

گووتی: لە ناوەوە ئەزیەت بەر سەری کەوتوە دەمارێکی تەقاندوە پێویستی بە نەشتەرگەریەکی گەورە هەیە! هێز لە گیانم نما لەسەر کورسی دانیشتم تەنیا ئەوەندەم گووت: هەرچیت لەدەست دێت درێخی مەکە چی زووترە دەست بە چارەسەری بکەن.

گووتی: ژاڵە یاریدەدەرم بووە هاوکاری زۆری کردوم لە نەشتەرکاری، دڵنیابە ئەوپەڕی هەوڵی خۆم دەدەم، شیفاش لەدەست خوایە انشاءالله زۆر باش دەبێت.

چوار کاتژمێر لەناو ژووری نەشتەرگەری مایەوە. پەیوەندیمان بە خزم وکەسوکاری هەردوولامانەوە کرد، دایکو باوکی ژاڵە هەرزوو

گەیشتن، خوشکو برای منیش لەکاتی خۆیدا هاتن هەموو لەچاوەڕوانیدا بووین پزیشک هات ڕایگەیاند کەوا پرۆسەکە بەسەرکەوتویی کۆتایی هات. بردمانە ژووری خەواندن

بەڵام بەنج لەکاتی خۆیدا بەری نەدا مەترسی کەوتە سەر گیانی، هەموان شپرزەبوون دایکم تاقە کەسێک بوو ئارامگری پێوە دیاربوو کاریگەری دەخستە سەر ئەوانیدیش تا ئارامبن بە تایبەت دایکو باوکی ژاڵە لەهەموان شپرزەتر دەردەکەوتن، بە هەوڵی پەرستارو نوێژ و نزای دایکم توانرا هۆشی بۆ بگەڕێننەوە، پزیشک بە ئێمەی ڕاگەیاند بیرەوەی لەدەست داوە بە تێپەڕبونی کات بەخواردنی دەرمان بەشێوەی پلەبەندی دەتوانێ باشتر بێتەوە، ئێوەش هاوکاری بەردەوامی بن بەڵکو زووتر بیرەوەی بۆ بگەڕێتەوە.

دوای خەواندن و مانەوەی حەفتەیەک لە نەخۆشخانە گەڕاینەوە ماڵ تاقە کەسێک ژاڵە هاتەوە بیری من بووم هەموو شتێکی ئەم دنیایەی بەلاوە نامۆ بوو چوبووە دنیایەکیتر پرسیاری سەیر و سەمەرەی دەکرد تەنها لەگەڵ منیش دەدوا، بڕێکجار وای بۆ دەچوم «لەمەچێتر» دەستیان لێ وەشاندبێ! کاتێکیش وەڵامم دەدایەوە ئەگەر بەدڵی نەبا دەستی بەگریان دەکرد. یەکەم پرسیار بەدەمی داهات ئاڕاستەی کردم گووتی:

+ ئێمە لەکوێین؟

- ماڵی خۆمان.

+ ماڵی خۆمان..! لەکوێیە؟

شاری هەولێر_کوردستان..

پرسیارەکانی درێژ کردەوە لە کۆتایی گووتم: ئێمە لەسەر زەوین لە ئاسمان وەستاوین بەبێ هیچ ڕاگرێک.

+ یانی چۆن؟

– واتە خودا وایکردوە ئێمە لەسەر تۆپێک بژین تۆپەکەش لە ئاسمانە.

+ خودا کێیە؟ بۆ ئێمەی لەسەر ئەو تۆپە بەماڵ کردوە پاشان فڕێیداوەتە ئاسمان؟

– خودا ئەو زاتەیە ئێمەی خەڵق کرد زەوی دروست کرد تا ببێتە ماڵ بۆ ئێمە.

+ خودا لەکوێیە، بۆ نایبینم، بۆ نایەتە ماڵمان؟

– لە عەرشە لەسەروی ئاسمانەکان، تۆ چاوت بچوکە ناتوانی گەورەیی ئەو ببینی، ئەگەر ئەقڵ و دڵت گەورەبن دەتوانی هەستی پێبکەی، ئەو ناچێتە هیچ ماڵێک بەڵکو ئێمە دەبێ بڕۆینە ماڵی ئەو.

+ بمبە بۆ ماڵی خودا دەمەوێ چاوم پێی بکەوێ.

– خودا لەماڵی خۆی نیە.

+ ئەی ماڵی بۆچیە کە بەخۆی لەوێدا نیە؟

– ئەو ماڵە بۆ بەندەکانیەتی تا رۆحی تینویان لەوێ تێراو بکەن بە سوژدەو پارانەوە...

+ ژن و منداڵی خوداش لەوێن یا ئەوانیش لە عەرشن؟

– خودا ئاتاج بە ژن و منداڵ نیە، نابێ لە ڕوانگەی ژیانو هەوەس و ئارەزوی مرۆڤەوە لێی بڕوانی، هیچ شتێک لەو ناچێ و وەک ئەویش نەبووە و نابێت، تەنانەت پەیامبەرانیش وەک ئەو نین.

+ پەیامبەر چیە؟

– مرۆڤن بەڵام ئاسایی نین نوێنەری خودان لەسەر زەوی تا خەڵکی لەڕێی شەیتان بگێڕنەوە بۆ ڕێی ڕاست.

+ شەیتان چیە، لەکوێیە؟

– ئەو تۆپەڵە ئاگرەیە دژی مرۆڤایەتی دەجەنگێ خودا دەرفەتی داوە بژیەت بەندەکانی پێ تاقی دەکاتەوە، لاوازی شەیتانیش نیشان دەدات بەرامبەر گەورەیی و دەسەڵاتی خۆی، واتە خودا.

شوێنی شەیتان لەناو ئەو کەونەیە کە زەویەکەی ئێمەی تیدایە.

+ کەون لەکوێیە؟

– ئەوە پرسیاریکی هەڵەیە چونکە تۆ لەناو کەونداى ئەگەر لە جیهانیکیتر بای، ئەوسا پرسیارەکەت دروست بوو.

ماندوو بووم لە وەڵامدانەوەی پرسیارە زۆرەکانی، بانگی دایکم کرد بێت بەدیاریەوە دانیشێ تا من بخەوم بەیانی دەچوومە سەرکار، وەک هاوکاری کاتی کارکردنم بۆ دوو کاتژمێر کەمکرابۆوە تا زیاتر لەماڵ بم و ئاگام لە ژاڵە بیت.

ڕۆژی هەینی لە وتاری مزگەوتدا مامۆستا باسی «ئیسلام»ی دەکرد گووتی:

،،زیاتر لە بەرنامەیەکە بۆ ژیان، خودی ژیانە خۆراکی مێشکە، پەیڕەو کردنی ئاسودەیی دەبەخشێتە دڵ و دەروون. ئیسلام کۆتا پرسیارە وەڵامەکەی بەهەشتی نەبڕاوەیە،،

ئەم وتارەم بەلاوە زۆر کارتێکەر بوو چونکە سەد لەسەد نرخ و پێگەو ئامانجی ئیسلامی دیاری کرد. سەیرێکی حاڵی خۆمم کرد ئاخۆ لەبازنەی ئیسلامدا هەم تا وەڵامی بەهەشت ئەنجامم بێت.

چەندی کردم خۆم هیناو برد نەمتوانی دڵم ڕازی بکەم بەوەی موسڵمانێکی عەییارم و دەچمە بەهەشت، ترسم گەیێ وامدەزانی ئەگەر کەسێک هەبێ دوای ابولەهەب بچێتە دۆزەخ منم! خراپەکانی خۆمم دەژمارد لەکاری بێ باوەڕان دەچوو، یەکەم تاوانم زۆر باش بیرە تەمەنم پێنج ساڵێک دەبوو لەسەر بانی خانوە بچوکەکەمان فەرخە کێشکەی لێبوو گرتم سەریم لە ملیڕا قرتاند فڕێمدا ماڵی دراوسێکەمان!

لە هەشت ساڵی شانەی زەنگەسوورەم سوتاند، لە سێزدە ساڵیدا مریشکی ماڵی پوور ئامینەم بە بەردێک کوشت، لەسەر دیواری ماڵی مام ڕەسوڵ بێ ئاگاداری ئەوان دانەیەک پرتەقاڵم لێکردەوە  خواردم، لە قوتابخانە پەڕی تێنوسی هاوڕێکەم دزی بۆ تاقی کردنەوەی وانەی ئاین! نزاشم کرد خودا سەرکەوتوم بکا، زۆر گوناهیترم ئەنجام داوە کەوا لە ڕووم نایەت باسی بکەم...

نازانم چۆن خودا تا ئێستا بەزەویدا نەیبردومەتە خوار، لەبەر ئەو تاوانانەی ئەنجامم داون!

بۆ دڵنەواییم قورئانم خوێند لە سورەتی «ابراهیم» چاوم کەوتە سەر ئایەتی٤٢ خودا دەفەرموێ (ولا تحسبن الله غافلا عما یعمل الظالمون انما یؤخرهم لیوم تشخص فیه الأبصار) بەجۆرێک دڵم توند بوو وام دەزانی هەرچی دەستی دنیا هەیە دڵمی خستەوەتە ناو لەپی و دەیگوشێ، چاوەکانم فرمێسکیان تێزا، شنگم نما، کەوتمە حاڵێک مردنم بەچاوی خۆم دی بەڵام رووح قایم بوو لەجەستەم نەهاتەدەر. بە پەلە

بووم تا بە کاتی عەسر بگەم و خۆم بگەینمە مەلای مزگەوت حاڵی خۆمی بۆ بەیان بکەم. دایکم هات روخساری تێکچوو بوو گووتی:

+ ژاڵە دەگریت.

- لەبەرچی؟

+ لەبەرئەوەی نازانم وەڵامی پرسیارەکانی بدەمەوە.

- پەیوەندی بە دایک و باوکیەوە بکە بێن کەمێک بەدیاریەوە دانیشن قسەی لەگەڵ بکەن یا چەند رۆژێک بیبەنەوە بەلکو ژینگەی نوێ کاربکاتە سەر بیرکردنەوە تەندروستیەکەی.

بانگی عەسر درا خێرا مالئاواییم لەدایکم کرد بەرەو مزگەوت هەنگاوی گورجمنا لە ریزی پێشەوەی پشت مەلا وەستام بۆ ئەوەی زوو بەری پێبگرم چارەیەکی حاڵم بکات.

نویژ تەواو بوو ئایەتی کورسی و زیکرەکانم بەخیرایی تەواو کرد تاقە نزایەک کردم گووتم: خوایە لێم خۆشبە.

هەڵسام بەرامبەر مەلا دانیشتم سلامم لێکرد دۆقەی گەرممان کرد سەرەتا ئیزنم لێ خواست ئەوسا چوومە ناو باسەکە و حالی خۆمم بۆ بەیان کرد هەموو تاوانەکانم بۆ گێڕایەوە تا گەیشتمە ئەو کاتەی چاوم بە سورەتی ئیبراهیم ئایەتی ٤٢ کەوت حاڵم زیاتر تیکچووە ترس دایگرتووم، چارەم چیە؟

مەلای بەتەمەندا ڕۆیشتوو ئاقڵ و ژیر سیما نورانی ریشە سپی و درێژەکەی بەدەستی راست بۆ خوارە داهێناو گووتی:

+ کوڕەکەم لەوە دەچێ تازە هاتبیتە ئەو گەڕەکە پێشتر تۆم لێرە نەدیوە؟

- بەڵێ وایە تازە هاتوین.

+ ناوت چیە؟

- ئادەم.

+ کاکە ئادەم سوپاسی خودا بکە هێشتا چرایەکی ئیمان لە ناختدا گەشە، ئەم ترسەی تۆ نیشانەی ئیمانداریە ئەو تاوانانەی تۆش ئەنجامت داون لە تەمەنێکی بچوک و هەرزەکاریدا بووە ئێستاش مادەم پەشیمانی لەو کارانە خودا لێت خۆش دەبێت ان شاءالله، دەربارەی ئایەتی ٤٢ی سورەتی ئیبراهیم ئەوە بۆ کەسێکە بەردەوام بیت لەسەر تاوان و تۆبە نەکات. لە سورەتی الزمر ئایەتی ٥٣ دەفەرموێ: (قل یا عبادی الذین أسرفوا علی أنفسهم لا تقنطوا من رحمة الله ان الله یغفر الذنوب جمیعا انه هو الغفور الرحیم) لەگەڵ ئەم ئایەتە هەناسەیەکم هاتەوە بەر ئاسودەییەک بەدڵ و دەرونم گەڕا وەک بڵێی خودا ئەو ئایەتەی بەتەنها بۆمن ناردبێ ئەوەندە پێی دڵخۆش بووم.

فەرموودەیەکی بۆ گێڕامەوە گووتی:

ڕەسوڵی نازدار حەزرەتی محمدﷺ دەفەرموێ خودای گەورە دەفەرموێ:

(گەر بەئەندازەی زەوی تاوانت کردبێ پاشان کە گەشتی پێم هاوبەشت بۆم بڕیار نەدابێ، بەئەندازەی هەموو زەوی لێخۆشبونت پێدەبەخشم)

کوڕەکەم، هەرگیز وەک بێ دینان لە قورئان و ئیسلام مەڕوانە واتە: یەک دیوی تەماشا مەکە تەنها لایەنە بەئێش و ئازارو دۆزەخیەکەی مەبینە لێبوردەیی و میهرەبانی و خۆشی و بەهەشتەکەشی بێنە بەرچاوت هاوسەنگی ڕاگرە بۆ ئەوەی بتوانی چێژی ئیمان بکەیت.

قسە پڕ خێرو بەرەکەتەکەی تەواوبوو ماڵئاواییم لێکرد بەتالوکە گەڕامەوە خەسو و خەزورم لەبەردەرگا وەستابوون بەخێر هاتنم کردن بەیەکەوە چوینە ژوور ژاڵە بە دیتنی دایکی گریا کاتێک لەباوەشی گرت گووتی: نازانم بۆ ئەو ژنەم خۆشدەوێ. سەیرێکی باوکی کرد خەندەیەکی بەڕوویدا نواند پێی گووت: ئەتوم خۆشدەوێت چونکە لە پیاوێکی باش دەچیت، دۆخەکە بەرەو باشی دەچوو بەتایبەت تەندروستی ژاڵە و حاڵی من.

نانی ئێوارەمان بەیەکەوە خوارد دوای نوێژی عیشا ژاڵەیان بردە ماڵی خۆیان.

گەورەیی خودا چەند بێ سنوورە لە پڕتاوێک دۆخەکەی بەرە باشی برد! لەم کاتەدا زۆر باش لە مانای (کن فیکون) تێگەیشتم.

بانگخوازێکی عەرەب دەیگووت:

پیاو چاکێک هاتوەتە لام گووتویەتی بە پازدە ساڵ قورئانم خەتم کردوە! هیچ ئایەتێکم بەسەردا تێپەڕ نەبوە ئیللا زانیومە خودا چی لێم دەوێ داوای چیم لێدەکا.

سەیرێکی ئیمانداری خۆم کرد لەگەڵ پیاو چاکەکە بارتەقام کرد لە ئاستێکی زۆر نزم دابووم ئیرەییم بە باوەڕداری ئەو دەبرد ئاخۆ پێگەو جێگەو ڕێگەی لای خودا چەند بەرز بێت.

زەنگی مۆبیلم بەرزبۆوە تەماشایەکم کرد خەسووم بوو دڵم خورپەی کرد ترسام ژاڵە شتێکی بەسەر داهاتبێ!

بە ترسەوە وەڵامم دایەوە بێ ئەوەی سڵاو بکات گووتی:

ژاڵە منی کەوتەوە بیر دەزانێت من دایکی ئەوم.

دڵخۆشیم نیشاندا سوپاسی خودام کرد، گووتی: ئەگەر یەک دوو ڕۆژ زیاتر لێرە بیت دەتوانین وابکەین شتی زیاتری بێتەوە بیر.

ڕازی بووم بەوەی حەفتەیەک لایان بێت هاوکاری بکەن بۆ ئەوەی تەندروستی باشتر بێت.

هەندێک قسەم لەگەڵی کرد دیاربوو کەشوهەوای ماڵی باوکی زیاتر لەبارە بۆ زووتر چاک بوونەوەی چونکە ئەوان قەرەباڵغتر بوون، خوشکو براکانی هەر لە دەوری بوون وێنە کۆنەکانیان پیشان دەدا، خەریک بوو باوەڕی بۆ دروست دەبوو ئەویش وەک ئێمە مرۆڤێکی ئاساییە ڕابردووی هەیە نامۆ نیە بەم ژیانە.

هەر مرۆڤێک ڕابردووی نەبوو ئێستاشی نابێ، لەبەرئەوەی بوونی «ئێستا» یەکەم خشتی بناغەکەی لە ڕابردوو بنیات دەنێ.

دووبارە زەنگی مۆبیلم بەرز بۆوە سەیرم کرد شەهریاری هاوڕێمە داوای کرد هێلی نێت بکەمەوە لە مەسنجەر گفتوگۆ بکەین لەسەر ئاین! پەیوەندیەکەی داخستەوە چوومە مەسنجەر نامەی ناردبوو.

+ سڵاو.

- سڵاو سەر چاو.

+ راستەوخۆ دەچمە سەر پرسیارەکەم.

- فەرموون چاوەڕێم.

+ ئێمە لەبەرچی دەبێ ئایینی ئیسلام هەڵبژێرین؟

- هۆکار زۆرە، بەڵام نمونەیەک کافیە.

ئایین زۆرن هەیانە دەسکردی مرۆڤن هەشیانە نێردراوی خوان

تۆ کامیان هەڵدەبژێری؟ ئایینێک هی خودایەو پاداشتی تێدا، یا ئەوەی مرۆڤ دروستی کردوە جگە لە ماندوێتی هیچ پاداشتێکی تیا نیە.

+ بێگوومان ئەوەی خودا هەڵدەبژێرم، بەڵام بۆ دەبێ ئیسلام هەڵبژێرم؟

– لەبەر ئەوەی کۆکراوەی هەموو دینەکانی خودایە، تەواوی ئایینەکان لە ئیسلامدا بوونیان هەیە بەڵام ئیسلام لە ئایینەکانیتردا نیە.

+ یانی چۆن؟ تێناگەم.

– واتە ئەو پەیڕەو پڕۆگرامەی لە ئیسلامدا هەیە لە دینەکانی دیکە کەم بووە یاخود هەر نەبووە.

+ شتێکم پێ بڵێ لە ئیسلام دا هەبێت و لە ئایینەکانیتردا نەبێت.

– باشە، سێ خاڵت بۆ دەست نیشان دەکەم..

* سادەو ساکاری، هیچ کارێکی وا قورس و زەحمەتی نەخستوەتە سەر پەیڕەوکارانی توانای ئەنجامدانیان نەبێت.

* گشتگیری، واتە بۆ هەموو نەتەوەکان هاتووە بێ جیاوازی تایبەت نیە بە قەومێک و ناوچەیەک.

* ئیداری دەوڵەتداری، ئیسلام عەرەبەکانی کۆکردەوە لەژێر یەک چەتردا و بەڕێوەیبردن فێرکردن دەوڵەتداری چیە.

ئەوانە چەند جیاوازیەکی سەرەتایی بوون لە نێوان ئیسلام و ئایینەکانی دیکەدا.

+ تاڕادەیەک باوەڕم بۆ دروست بوو کەوا ئەو وەڵامانە ئەگەر بە قووڵتر قسەی لەسەر بکرێ لە چوارچێوەی سەردێر نەمێنێتەوە بەهێزتر دەبن.

– بێگوومان وایە، هەوڵبدە خوێندنەوەی ورد و بەدوا داچوون بۆ ئەم خاڵانە بکەیت ئەوسا وەڵامی چاکت چنگ دەکەوێ بۆ ئەو پرسیارەی کە فەرمووت: بۆ دەبێ ئیسلام هەڵبژێرین.

+ بێ دوودڵی وادەکەم..

سوپاس بۆ وەڵامەکانت

بۆ ئەوکاتەی بە منت بەخشی

شەوشاد.

– کاتت شادتر، خوات لەدڵ.

بەخێرایی خۆم کۆکردەوە بەجەستەکی کفت دەرونێکی ماندوو خەوتم کات چواری بەیانی لەگەڵ دەنگێکی نامۆ خەبەرم بویەوە بە هێمنی لەناو جێگەدا هاتمەدەر بەرەو سەرچاوەی دەنگەکە ڕۆیشتم لە ژووری دایکم بوو بە پەشۆکاویەوە دەرگاکەم کردەوە دایکم بینی لەسەر بەرماڵەکە لە سوژدەدایە بەگریانەوە خەریکی نزایە دەپاڕێتەوە لەخودا، نەمویست لەو خواپەرستیەی دابڕم بێ دەنگ بۆ دواوە گەڕامەوە لە گەرماوەکەدا دەستنوێژم گرت بەخێرایی لە تەنیشتی نویژی شەوانم دابەست چێژێکی تایبەتی هەبوو جیاواز لە نویژەکانیتری سوننەت بوو! تا بانگی بەیانی بەیەکەوە نوێژ و نزامان کرد.

دوای نیوەڕۆ لەسەر کار گەڕامەوە گەنجێک بەدوامەوە بوو گومانم لێی کرد چەند جارێک ڕێڕەوی خۆم گۆڕی خێرا دەرۆیشتم، دەوەستام، هەربەدوامەوە بوو گومانەکەم بوو بەڕاست لە کۆتایی گەیشتین بە نزیک پاڕکێکی بچوک، لەوێ بانگی کردم ئاوڕم لێی دایەوە گووتی: بابەتێک هەیە دەمەوێ لەگەڵت باسی بکەم! ماندوو بوونی زۆرم دی تاوەکو تۆم دۆزیەوە.

دلم خورپەی کرد، بەڵام لەگەڵ خۆمدا ئینکاریم کرد لەگەڵی چووم بۆ پارک بەیەکەوە دانیشتین خۆی ناساند دەستی بە قسان کرد سەرەتا زۆر ئاسایی بوو تا ئەو جێیەی باسی ژاڵەی کرد!

دانم بەخۆدا گرت هیچ کاردانەوەم نەنواد وام بیرکردەوە یەکێک بووە لە خوازبێنیەکانی و ڕەتکراوەتەوە بۆیە هاتووە قسەی بۆ هەڵبەستێ.

بەوەندە نەوەستا مۆبیلی دەرهێنا بەشێک لەو نامانەی نیشان دام کەوا ژاڵە بۆی ناردبوو! هی ئەو سەردەمە بوو کەوا بەیەکەوە خوێندکار بوون لە پەیمانگا، گووتم: ئەوانەی تۆ باسیان دەکەی لە ڕابردوو بووە هیچ گرفتێک بۆ سەردەمی ئێستا دروست ناکا.

گووتی:

سەیرێکی ئەم وێنانەش بکە دواتریش ئەگەر ویستت بە نامە بۆت دەنێرم.

تەماشایەکی وێنەکانم کرد شۆک بووم چەندین وێنەی بۆ ئەم کوڕە ناردبوو کۆتا وێنەش کەوتە بەرچاوم وێنەیەکی سەردەمی پەیمانگابوو بەتەنیشت یەکەوە گرتبویان!

زۆر کاری تێکردم چاوەکانم سوور هەڵگەڕان خەریک بوو پەلاماری بدەم، گووتی: دەزانی بۆ هاتووم ئەو وێنانەم نیشان دایت؟

بە ڕقەوە گووتم: نەخێر نازانم.

مۆبیلەکەی بەبەرچاوی منەوە شکاند گووتی: هاتووم پێت بڵێم زۆر ئاگات لە ژاڵە بیت ئامادە بووم بمرم بۆی بەڵام باوکی من بەهیچ شێوەیەک ڕازی نەبوو هاوسەرگیری بکەین. ئێستاش چوار ساڵ بەسەر ئەو ڕۆژانە دا تێپەڕ دەبێت.. ئاهێکی قوڵی هەڵکێشا لەسەر کورسیەکە هەڵسا بێ

ماڵئاوایی کردن ڕۆیی، نەمزانی چی بکەم دڵم خەریک بوو شەق ببا بە دڵتەنگی ملی ڕێگام گرت گەیشتمەوە ماڵ سڵاوم لەدایکم نەکرد خێرا چوومە ژوورەکەم پاڵکەوتم تێر گریام بەجۆرێک دەنگم دەرکردبوو دایکم ڕایکردە ژوور سەیرێکی حاڵی کردم بێ ئەوەی هیچ بپرسێ بۆمن گریا لێم نزیک بۆوە باوەشی پێدا کردم گووتی: بۆ دەگریت؟

سەرم توند بە شانیەوە نوساند بەدەم گریانەوە گووتم:

بۆ ئەوە هاوسەرگیریم کرد نیوەی ئیمانم تەواو بێت بەڵام ئەوەی هەشم بوو خەریکە لەدەستی بدەم.

وەک هەمیشە داوای لێکردم ئارام بگرم ئەوسا قسەی بۆ بکەم مەسەلە چیە؟

تەنها ناوی ژاڵەم هێنا، گووتی:

+ چاوەڕێی ئەم ساتەم دەکرد ڕووبدا.

- مەگەر تۆ شتێک دەزانیت؟

+ بەڵێ، زۆر شت دەزانم.

شۆک بووم بە توڕەییەوە گووتم:

- ئەی بۆچی لە پێشدا هیچت بەمن نەگووت؟

+ بە گرنگم نەزانی، پێویستیش نەبوو.

- چۆنت زانی کێ پێی گووتی.. ژاڵە؟

+ نـــا، هەر ئەو کوڕەی قسەی بۆ کردی پێرێ هات لەبەر دەرگا بۆی گێڕامەوە وێنەکانیشی نیشان دام گووتی: ئەگەر کوڕەکەت ئەوانە ببینێ ئەوسا مۆبیلەکە دەشکێنێت.

– بەڵێ وایکرد؛ لەبەر چاوی من شکاندی، بەڵام چارەی من و ژاڵە چی دەبێ بەکوێ دەگات؟

زۆر قورسە بۆ پیاو لەگەڵ ژنێک بژیت پێشتر کوڕێکیتر خۆشی ویستبێ.

+ ئاساییە کوڕم قسمەتی یەکتر نەبوونە ئەوە قەدەری خوایە.

پێویستە لەسەرت ئەوە بزانی کەوا ئەگەر حاڵی ژاڵە باش بۆوە گەڕاوە دۆخی ئاسایی خۆی نابێ ئەو نهێنیە بەڕوویدا بدەیتەوە بەجۆرێک رەفتار بکە هەرگیز هەست نەکات تۆ ڕابردووی ئەو دەزانیت.

ئەگەر نهێنی و ئابڕووی کەسێک بپارێزی خوداش ئابڕووی تۆ دەپارێزی.

– نازانم چی بکەم هەرگیز ئەوەم بە خەیاڵدا نەدەهات هاوسەرگیری لەگەڵ کەسێک دەکەم ڕابردووی بەو شێوە بێت.

+ ڕابردووی ژاڵە چیەتی! بۆ ئاوها بیر دەکەیتەوە؟

– نازانم، جارێ مێشکم جام بووە دواتر قسەی لەسەر دەکەین ئێستا دەبێ پشوو بدەم.

+ خەریکە بانگی عەسر دەبێت، naڕۆیتە مزگەوت؟

– ئەی نالێم ژاڵە ئەو ئیمانەی هەشم بوو نەیهێشت، نامەوێ بڕۆمە مزگەوت لەماڵ نویژ دەکەم.

هەستاوە سەرپێ توند شانی گرتم گووتی:

+ ئەگەر واز لە مزگەوت عیبادەت کردن بێنی چیتر لەماڵی مندا جێت نابێتەوە، بەندەی چاک لەو حاڵەتانەدا زیاتر ڕوو لەخودا دەکات بەڵام تۆ دەتەوێ چاک نەبیت پشت هەڵدەکەی لە عیبادەت و ماڵی خودا؟

دەنگی بانگ بەرز بویەوە، ئارام بۆوە بەهێمنی گووتی: کوڕەکەم خودا بانگت دەکات بۆ ماڵی خۆی تا سەرفرازیت پێ ببەخشێ بڕۆ بەدەم داواکەی سکاڵاو حاڵی دڵت لە سوژدەیا بەیان بکە گومانت نەبێ وەڵامت دەداتەوە.

خێرا دەستنوێژم گرت بەرەو ماڵی خودا هەنگاومنا لە ریزی دواوە وەستام لە سوژدەیا سکاڵای دڵم بۆ خودا بەیان کرد.

دانیشتم خەلکی بەتاک و کۆمەڵ دەچونەدەر مەلا هات لەتەکم دانیشت سڵاوی کرد دۆقەی گەرممان کرد گووتی:

+ ڕوخسارت وای نیشان دەدا لە کێشەدا بیت کاکە ئادەم؟

- نــا، شتێکی وانیە.

+ مرۆڤ بە شتێکی واکەم بەوجۆرە پەرێشان نابیت، بڵێ بزانم چیت لێ قەوماوە.

- ئەوەی ڕاستی بێت زۆر خراپیش لێم قەوماوە بەڵام بە خودام گووتوە ئەو چارەی کێشەکەم دەکات.

+ کەوابێ من دەکشێمەوە هەر کارێک بەخودا سپێرا بێت بۆ بەندە فزوڵیە تخونی بکەوێت و خۆی تێدا هەڵقورتێنێ.

- بۆ مەگەر بەندە هەیە جورئەت بکا خۆی لە قەرەی کارێکی وا بدات؟

+ بەڵێ کوڕەکەم ئەوانەی رووقایمن خۆیان لە کاروباری خودا هەڵدەقورتێنن لە ژێر ناوی زانست و زانیاری.

- حوکمیان چیە لەشەرعدا؟

+ نازانم.

- تۆ زانای ئایینیت چۆن دەڵێی نازانم؟

+ نەزانی شورەیی نیە پێویست ناکات ئەوها واقت وڕبمێنێ.

راستە زانای ئایینیم بەڵام موفتی نیم ناتوانم حوکم بدەم شەرمیش دەکەم سنوریان ببەزێنم و لەبری ئەوان فەتوا بدەم.

- سەیرە! تۆ شەرم لە موفتی دەکەی کەچی خەڵکی شەرم لە خودا ناکەن!

+ جیاوازی نێوان کەسێکی باوەڕدار و کەسێکی ئاسایی لەوەدایە

باوەڕدار شەرم لەوانە دەکا زانستی خودایان لەدڵ هەڵگرتوە چ بگات بە خودا

کەسانی ئاسایی حسێب بۆ زانایان ناکەن و راستەوخۆ تخونی کاری خودا دەکەون.

کاری ئیسلام بریتیە لە «شەرم» موسڵمان لەسەر ڕەوشتی بەرز پەروەردە دەکات بۆ ئەوەی سنورەکان بزانێت.

- موسڵمان هەیە زۆر بێ شەرمە ئیسلام نەیتوانیوە فێری بکات سنوری خۆی بزانێت.

+ نـا کوڕەکەم بەوجۆرە نیە، ئیسلام تەنها بەرنامەیەکە ئەتۆی مرۆڤ ئەگەر لەسەر خۆتدا هەنگاوەکانت جێبەجێ کرد ئەوکات دەبیتە موسڵمانێکی بەشەرم.

ئەگەریش واتنەکرد ئیسلام هیچ خەتایەکی نیە بەڵکو خەتا لە ئێمەی زانایانە نەمانتوانیوە بەشێوەی دروست بۆ خەڵکی بەیان بکەین،

کەسانێکیش هەن لە بنەڕەتەوە بڕیاریانداوە هەرگیز گوێ بۆ ئێمە نەگرن و ئیسلامیش ڕەت دەکەنەوە.

کات درەنگی کرد سوپاسی مەلام کرد بۆ قسەکانی ماڵئاواییم لێکرد لەبەردەگای حەوشەی مزگەوت چاوم بە کەسێک کەوت هەرگیز لەخەیاڵم نەبوو لێرەدا بیبینم! هەردوو گەش بووینەوە بەرەو ڕووی یەک چووین سلاومان کرد توند باوەشمان بەیەکدا کرد لەخۆشیا دەمێک وەستاین لەیەکمان دەڕوانی، پرسیم چی دەکەی لێرە؟

گووتی:

لەمزگەوت سۆراخم کردی ماڵە کۆنەکەتانم دۆزیەوە، لە دراوسێکانم پرسی ناونیشانی ماڵە تازەکەیان پێدام ئەمڕۆ هاتم دۆزیمەوە لە دەرگامدا دایکت کردیەوە پرسیاری تۆم کرد فەرمووی لە مزگەوت نەهاتویەوە داوای کرد دانیشم چاوەڕێت بم بەڵام پێم باشتربوو لەگەڵ تۆ لەدەرگا بڕۆمە ژوور نەک بەتەنها.

مەلا هات سلاوی کرد گووتی:

+ کاکە ئادەم ئەم پیرە پیاوە نورانیە کێیە؟ دەمێکە کەسم نەدیوە ئاوها بە تاسەوە یەکدی لەباوەش بگرن.

- لە مزگەوتی گەڕەکە کۆنەکە مامۆستام بوو فێری خواناسی کردم ڕۆژانە وانەی پێدەگووتم.

مەلا توند دەستی گرت و ماچی کرد گووتی:

دەبێ بڕۆینە مالی ئێمە میوان بن بەڵکو بەهۆی تۆ خودا بەرەکەت بخاتە ڕزق و ماڵی من.

گووتم:

ئەوە میوانی منە ئەتۆش وەرە ئێوارێ خوانی دایکم بەرەکەتدار بکەن.

گووتی:

شەو پاش نوێژی عیشا دێم.

مالئاوایی لێکردین ئێمەش وەڕێکەوتین دەستی چەپی گۆچان بوو بە ڕاستەش توند دەستی منی گرتبوو بە هێمنی دەڕۆیشتین وەک باپیرەو نەوە دەهاتینە بەرچاو، سڵاوم لەهەر یەکێک لە دراوسێکان دەکرد گەرمتر لە پێشوو وەڵامیان دەدامەوە، ئەوەش بەرەکەتی پیرە پیاوەکە بوو

گەیشتینەوە ماڵ لەدەرگای حەوشەمدا پاڵمدا بڕۆمە ژوور توند ڕایکێشام

گووتی:

لە ژوورەوە ئافرەت هەیە؛ چاوەڕێکە تا ئیزنت دەدا ئەوسا دەڕۆینە ژوور.

گووتم:

ماڵی خۆمانە ئەو ئافرەتەش دایکمە.

گووتی:

با دایکیشت بێ هەردەبێ سەرەتا ئیزنت بدا ئەوسا بڕۆیتە ژوور، ئەوسا منیشت لەگەڵە بەتەنها نیت بۆیە پێویستە چاوەڕێ بین.

دایکم هات دەرگاکەی کردەوە فەرمووی لێکردین لە دیوەخان لەبەردەم زۆپا دانیشتین بەدەم چایی خواردنەوە ئەحواڵپرسی کردم.

کاتێ پێم گووت: هاوسەرگیریم کردوە بەڵام بەهۆی ڕووداوێک بیرەوەری لەدەست داوە.

زۆر دڵگران بوو دەستی بەرز کردەوە بۆ ئاسمان لەخودا پاڕایەوە شیفای بۆ بنێرێت.

نوێژی مەغریب و عیشامان لەمزگەوتێ کرد ئەوسا نانی ئێوارەمان دەست پێکرد، لەدەرگا درا دایکم گووتی: ئێوە ئاسودە بن نانی خۆتان بخۆن رەنگە ژنی دراوسێ بن کاریان بەمن بێت.

خەریک بوو ئاوم دەکردە گلاسەوە بۆ میوانە نورانیەکە، مەلا وەژوور کەوت سلاوی کرد، فەرمووی خوانەکەمان لێکرد هەرسێ بەیەکەوە خواردنێکی باشمان خوارد.

ئەو شەوە ماڵی ئێمە جۆرێک رۆشن بوو بە چاو و دڵ هەستی پێدەکرا خۆم بە بەختەوەرترینی دنیا دەزانی لەخزمەتی ئەو دوو پیاوە ئیماندارە دانیشتووم قسەو وشەکانیان بریتی بوو لە یادی خوداو پەیامبەرﷺ و گەورەیی ئیسلام.

پیرەپیاوەکە لە باس و گەورەیی محمدﷺ لەلایەن خوداوە دەستی پێکرد گووتی:

+ خودای گەورە هەرگیز ناوی پەیامبەری بەناوی خۆی بانگ نەکردوە هەردەم وشەیەکی ڕێزدارانەی بۆ بەکار بردووە، بەڵام بۆ پەیامبەرانیتر وانەبوە لە سورەتی بەقەڕە ئایەتی ٣٥ دەفەرموێ:

(وقلنا یا ادم اسکن انت وزوجک الجنة...) راستەوخۆ ناوی باوکە ئادەمی هێناوە.

بۆ پەیامبەر محمدﷺ لە سورەتی تۆبە ئایەتی ٧٣ دەفەرموێ:

(یأیها ألنبی جهد الکفار والمنفقین...) دەبینی لێرە وشەی «نەبی» بەکار هێناوە، کە ئاماژەیە بۆ گەورەیی ڕێزداری ئەو زاتە.

لە سورەتی هود ئایەتی ٤٦ دەفەرموێ:

(قال ینوح إنە لیس من اهلک...)

لە سورەتی مەریەم ئایەتی ٧ دەفەرموێ:

(یزکریا إنا نبشرک بغلمـ اسمه یحیی...)

لە سورەتی نەمل ئایەتی ١٠ دەفەرموێ:

(...یموسی لاتخف إنی لایخاف لدی المرسلون)

لە سورەتی ئەحزاب ئایەتی ١ دیسانەوە ناوی پەیامبەر نابات دەفەرموێ:

(یأیها ألنبی اتق ألله ولاتطع الکافرین...)

لە ئایەتی ٥٩شدا دەفەرموێ:

(یأیها ألنبی قل لأزواجک وبناتک ونساء المؤمنین...)

لە سورەتی صافات ئایەتی ١٠٤ ڕاستەوخۆ ناوی پەیامبەر ئیبراهیم دەبات دەفەرموێ:

(وندینه أن یاإبراهیم)

ئەوانە هەمووی بەڵگەن لەسەر گەورەیی و ڕێزداری پەیامبەر محمدﷺ.

بە شەرمەوە دەستێکم هەڵبری ئەگەر ئیزنم بدەن پرسیارێک بکەم؟

مەلا خۆی وێک هیناوە گووتی: لە حزوری ئەم زانا نورانیە من ناتوانم هیچ قسەیەک بکەم.

پیاوە نورانیەکە خەندەیەکی کرد گووتی: گەندەڵترین مرۆڤی دنیا منم! فرمێسک بەچاویدا هاتەخوار دەستی خستە سەرچاوەکانی نەیتوانی بەدزیەوە بگریت لە پرمەی گریانی دا، ئێمەش سۆزمان جولا گریاین ئاو لەچاومان زا دلۆپەی کرد ڕژایە سەر ڕومەتمان.

بەدەنگی پڕ گریانەوە پێی گووتین:

هەرگیز بە ڕووکار و قسەی جوانی هیچ کەس مەخەڵەتێن خودا سەیری ناخ دەکات ئێوە چوزانن ناخی من چۆنە، ئەوها نورانی ڕوخسارم دەبینن فریو مەخۆن رەنگە ناخم تاریکستانی ئەنگوستەچاو بێت.

ڕووی تێکردم گووتی:

+ ئادەم گیان کوڕەکەم پرسیارەکەت چیە؟

– پرسیارەکەم بیر چۆوە لەبەر گریان و ئەو دیمەنەی بینیم.

+ ان شاءالله دێتەوە بیرت.

مەلا هاتە قسەو ڕووی لە پیرەپیاوەکە کرد، گووتی:

چەندی بیر دەکەمەوە تۆ لەو سەردەمە ناژیت! وەک سەردەمی پێش تەکنەلۆژیاو زانستی نوێ، ژیان دەکەیت.

خەندەیەکی شیرینی بە ڕووی مەلادا کرد پێی گووت:

تەکنەلۆژیاو زانستی نوێ چین؟

مەلا خەندەکەی لێ وەرگرتەوە و گووتی:

تەکنەلۆژیا ئەو مۆبیلەیە، دەستێکی بردە گیرفانی و دەری هێنا گووتی بەم پارچە ماددەیە دەتوانی قسە لەگەل ئەوپەڕی دنیا بکەی.

زانستی نوێ ئەوەیە زاناکانی ڕابردوو ئەگەر بە هەڵە لە خەڵقندەکانی خودایان کۆڵی بیتەوە، زانای ئێستا ڕاستیان کردۆتەوە بۆ نمونە زانستی نوێ دەڵێ مرۆڤ مەیمون نیە.

پیرەپیاوەکە گووتی:

ئەوانە هیچی نوێ نین! لەبارەی ئەم مۆبیلەوە، ڕۆژانە بەردەوام قسە لەگەڵ خودایەک دەکەم هیچ مۆبیلێکی پێشکەوتوو پێی ناگات، لە حەوت تەبەقەی ئاسمان ئاگامان لەیەکترە هەرکاتیش بمەوێ قسەی لەگەل دەکەم یا ئەو لەگەڵم دەکات.

لەبارەی زانستی نوێوەش پێم خۆش نیە قسە لەسەر بنیادی مرۆڤ بکەم چونکە ڕوونە ئێمە نەوەی ئادەمین، بەڵام زاناکان دەڵێن ئاو پێکهاتوە لە هەردوو توخمی($H_2O$ ) بە جیا هەن لە سروشتدا ئەگەر دەتوانن لێکی بدەن و ئاو دروست بکەن ئەوسا دان دەنێم بەو زانستەی کە هەیەو پێی دەڵێن نوێ.

دەستم هەڵبڕیەوە گووتم: پرسیارەکەم هاتەوە بیر!

پیرەپیاوەکە گووتی:

+ زوو بیڵێ تا بیرت نەچووە.

– هۆکار چیە خودا ئەوەندە ڕێزی لە پەیامبەری ئێمە ناوە؟

+ هۆکار زۆرن بەڵام ئەوەی من دەیزانم زۆر نیە.

- هەر چەندێک بێت بۆمن زۆرە چونکە ئێستا من هیچی لە بارەوە نازانم.

+ باشە، لەبەرئەوەی قەدەر وابوو کۆتا پەیامبەر بیت بۆ سەر زەوی، خودا بارتەقای هەموو پەیامبەرانی ڕابردوو گەورەی کرد هێشتا لە دنیا بوو کانیاوی کەوسەری لەبەهەشت پێدا!

لەبەرئەوەی بۆ گشت مرۆڤایەتی بوو دەبوو کەسێکی گەورە و بەشکۆ و ڕێزدار بێت خاوەنی چەندین دەرئاسا (معجیزە) بێت کە خودا بەتایبەت پێی بەخشی بوو، ئەو پەیامەی بۆ ئەو ڕەوانە کرا شاخ بەرگەی سەنگەکەی نەدەگرت، لەبەرئەوانەو چەندان هۆکاری دیکەش خودا بەوجۆرە محمدﷺی بەناوی خۆی لەقورئاندا بانگ نەکردوە.

مەلا گووتی:

بەڕاستی ئەو پرسیارو وەڵامانە بۆ من وانەیەکی باش بوون پێشتر ئەوانەم نەدەزانی.

پیرەپیاوەکە وەڵامی دایەوە گووتی:

مەلاکان بوونەتە چوار بەش

یەکەمیان:

زۆر توندن تەنها خەڵکی بێ دەسەڵات و کاسبکار دەترسێنن بە دۆزەخ، وازیان لە ئامۆژگاری و رەخنە لە دەسەڵاتی ستەمکار هێناوە.

دووەم:

زۆر شلن هەرچی خراپەی بچوک هەیە بەحەڵاڵیان زانیوە بۆ ڕازی کردنی دڵی خەڵکی، ڕازی کردنی خودایان بیرچووە، دەگەڕێن لەهەر

وڵاتێک، زانایەک موفتیەک ئیمامێک بۆ خەڵکی ناوچەیەک حوکمێکی دەرکردبێ، حوکمەکە دێنن دەی شەرعێنن بۆ خەڵکی خۆیان ئەگەر پێچەوانەی ئیسلامیش بێت گوێی پێ نادەن و پۆزشی بۆ دێننەوە کەوا فتوای زانای گەورەیە.

سێهەم:

جۆرێکن تیا ماون نازانن شلی بکەن یا توند لەکاتێکدا دەزانن ئەو دۆخەی تیایدان هەڵەیە.

چوارەم:

ڕێژەیان زۆر کەمە تەنها کار بە قورئان و فەرموده دەکەن، هەندێک جاریش بەپێی فەرمودەی (لا ضرر ولاضرار) بابەتەکە یەکلایی دەکەنەوە.

مەلا زۆر شەرمی کێشا کەوا بۆچی دابەش بوون بەسەر چوار گروپدا تەنها ئەوەندەی گووت: خودایە یەکمان بخەیت ببین بەیەک گروپ کار بە بەرنامەی تۆ بکەین و لە ڕێبازی پەیامبەر محمدﷺ لانەدەین.

پیرەپیاوەکە گووتی: خودا نزاکەت گیرا بفەرموێ لەسەر خێر، ئیدی کات بۆمن درەنگی کردوە پێویستە بگەڕێمەوە ماڵ.

هەوڵم دا شەو لامان بمێنێتەوە فایدەی نەبوو، مەلا گووتی: من دەتبەمەوە لە ڕێگاش هەندێک زانستم فێر بکە.

هەڵسان و ماڵئاواییان کرد لەگەڵ دایکم تا بەردەگا چووین تا ئەوان سواری ئۆتۆمبێل بوون دوا هۆڕنی ماڵئاواییان لێدا وەستاین.

گەڕاینەوە ژوور دایکم گووتی:

تازە قسەم لەگەڵ خەسوت کرد دەڵێ حاڵی ژاڵە باشە بەڵام بیری ئادەم دەکات، گووتم: بەیانی دوای گەڕانەوە لەسەر کار دەڕۆم دەیهێنمەوە.

لەناو جێگەدا پاڵکەوتم بیرم لە قسەکانی پیرە پیاوەکە دەکردەوە کەوا بۆچی پێشتر ئەو زانیاریە سادانە بە مێشکی مندا نەدەهات؟

کەوتمە گفتوگۆ لەگەڵ خۆم گووتم:

– مەبەستت چیە لە زانیاری سادە؟ هیچ شتێک نیە لە قورئان دا بەناوی سادە.

– مەبەستم بێ ئەرزش کردنی بابەتەکە نیە بەڵکو لە ئاسانی و ڕوونی بەرچاوی بابەتەکانە، کەچی درکم پێ نەکردوە؟

– کەوایە گلەیی لەخۆت بکە کە تێناگەی یا نابینی.

– دەبێ وابکەم، هەر بەڕاستیش من کوڵەوارم یەک دیوی بابەتەکان دەبینم دیوی دووەمی هەست پێ ناکەم.

بەدەم گفتوگۆوە خەو بردمیەوە بەیانی زوو بۆ نوێژ هەڵسام پێم خۆش بوو بڕۆمە مزگەوت لە مەلا بپرسم پیرە پیاوەکە زانستی چی فێر کردی دەمەوێ منیش فێربم بەڵام باران بوو نەمتوانی بڕۆمە مزگەوت لەماڵ نوێژم کرد.

ئێوارە کارم تەواو بوو نەگەڕامەوە ماڵ سەردانی ماڵی خەزورم کرد ژاڵە منی بینی بێئەوەی حسێب بۆ باوک و براکانی بکات ڕایکردە باوەشم شەرم دایگرتم بەڵام ئەوان زۆر دڵخۆش بوون بەوەی کچەکەیان هێشتا دەتوانێ من بناسێتەوە بە سەرکەوتنیان دەزانی، گووتی: با بڕۆینەوە!

خەزورم گووتی: کچم با کەمێ دابنیشێ پشوێک بدا قومێک ئاو پیاڵەک چایی گەرم بخواتەوە ئەوسا نانی ئێوارەش نەخۆن قەیدی ناکا بڕۆنەوە.

ژاڵە گووتی: نـــا، هەردەبێ بڕۆینەوە.

کەسیان نەیانتوانی دڵی کچەکەیان بشکێنن بۆیە گەڕاینەوە ماڵ کاتێک دایکمی بینی گریا توند یەکدیان لەباوەش گرت.

بەلامەوە سەیر بوو دایکیشم دەناسێتەوە! بە هەڵسوکەوتی دیار بوو تەواو ئاسایی دەهاتە بەرچاو لەوە نەدەچوو بیرەوەری لەدەست دابیت، ڕوانینی دایکم لە تەماشای جاروباری بۆ من ئاسایی نەبوو! بەڵام گوێم پێ نەدا، شەو هاتە لام ئاسایی ڕەفتاری لەگەڵ کردم هێشتا جلم نەپۆشی بوو گووتی:

+دەمەوێ هەواڵێکت پێ بڵێم.

سەرم سوڕما، گووتم:

– فەرموو.

+ هەواڵی یەکەم ان شاءالله دەبیتە باوک.

واقم وڕما! شۆک بووم نەمزانی چی بڵێم دلخۆش بم بەوەی دەبم بە باوک یا لەپڕ چاک بوونەوەی ژاڵە.

گووتم:

– واز لە منداڵەکە بێنە بۆ دوایی، تۆ چاک بویتەوە، ئاگات لێیە چەند ئاسایی ڕەفتار دەکەی؟

+ هەواڵی دووەم پەیوەستە بەو چاك بونەوەی من، كەوا نەساغیم و لەدەستدانی بیرەوەریم هەمووی سیناریۆ بوو.

- یانی چی! دەتەوێ بڵێی هەموو ئەوەی ڕوویدا دروستكراو بوو؟

+ بەڵێ.

- تۆ نەشتەرگەریت بۆ كرا.

+ پێشتر لەگەڵ پزیشك و هاوڕێ پەرستارەكانم ڕێكەوتبووم.

- تورە بووم بە دەنگێكی پڕ لە ڕق گووتم:

لەبەرچی وات كرد؟

فرمێسكی لەچاوەكانی زا دڵۆپەی كرد دەستی بە گریان كرد گووتی:

+ لەبەر ئەو كوڕەی پێشتر قەول بوو هاوسەرگیری لەگەڵدا بكەم پێی گووتم: دێ قسەت لەگەڵ دا بكات، ئەم بیرۆكەم دارشت وای نیشان بدەم بیرەوەریم لەدەست داوە تاوەكو توشی جیابونەوە نەبین، بەرگەم نەدەگرت جارێكیتریش توشی شكست بێم، ئێستاش بۆیە ئاشكرام كرد نەمتوانی درێژە بەو سیناریۆیە بدەم ویژدانم ئازاری دەدام.

- چەند كەس بەو سیناریۆیە یاخود بڵێم بەو درۆیەی تۆ دەزانن؟

+ سەرەتا دایكم دواتر پەرستارەكان دوێنێ شەویش بە تیلفۆن بە دایكتم ڕاگەیاند.

- كەوایە هەموان دەزانن نەفامێكی وەك من نەبێ.

+ دوور لەتۆ، نەفام من بووم هەموو شتێكم لێت شاردەوە.

– مادەم درۆت لەگەڵ کردم بەهیچ جۆرێک تخونی من نەکەویت، بە ئارەزوی خۆت دەچیت بۆ کوێ لەکوێ دەخەویت بۆمن گرنگ نیە تەنیا لەو ژوورە نەبیت منی لێ دەخەوم ناشمەوێ بتبینم.

+ هەوڵ مەدە لەخۆت دوورم بخەیتەوە دەروونم باش نەبێت ناتوانم ببم بەدایک.

– حەزناکەم منداڵی من دایکێکی درۆزنی هەبێت، باهەر نەبێت باشترە، ئێستاش لەبەر چاوم ون بە برۆ لە ژوورێکیتر بخەوە دەنا من دەڕۆم.

بەگریان و هەنسکەوە جلی پۆشی چووە دەرەوە بە زۆر خۆم گرتبوو تا ژوورەکەی جێهێڵا ئەوەندە گریام روومەتم بەهۆی سوێری فرمێسکەوە توشی زورانەوە هات نەمتوانی بخەوم هەرگیز خۆم بەوجۆرە نەدی بوو قسەی رەق و کاردانەوەی توندم ویژدانیان بەگەڕ خستبووم هەناوم دەکولا لەناخەوە زۆر پەشیمان بووم بەڵام لوتبەرزیم ڕێگر بوو بچم ئاشتی بکەمەوە.

کات خۆی لە شەشی بەیانی دەدا پێویست بوو لەسەرم خۆم بشۆرم، گەرماوی ئێمە لە شێوەی بازاڕ دروست کرابوو لە دوو بەش پێک هاتبوو بەشی یەکەمی ژوورێکی بچوکی خۆگۆڕین بوو بەشی دواوەی شۆرگە بوو دەرگای گەرماوەکەم کردەوە ژاڵەم بینی دیاربوو ئەویش تازە هاتبووە ئەوێ دانیشتبوو چاوەڕێی دەکرد تەشتەکە پڕ بێت لە ئاوی گەرم، منی بینی هیچ کاردانەوەی نەبوو وامزانی بەخاتری من دێ توونی باوەشم پێدا دەگرێ بەڵام وانەبوو هەستم کرد دڵی شکاوە نەمتوانی دان بەخۆمدا بگرم هەر وا بەدیاریەوە بوەستم خێرا هەنگاوم بزووت بەرەو ڕووی چووم لەگەڵی ئاشت بوومەوە.

داوای لێبوردنم کرد لەبەرامبەر رەقی قسەو کاردانەوەم بەرامبەری بۆ رووداوەکان.

وەک قەرەبوی ئەو رووداوە ناخۆشە پێم گووت:

بەیانی دیاریەکی چاوەڕوان نەکراوت بۆ دەکڕم.

بزەیەکی کرد فرمێسک لە چاوەکانی هاتە خوار، گووتی:

ئێستا هەمان ئەو ئادەمەی ئەو شەوەی لە نەخۆشخانە چاوم پێتکەوت چەند پاک و جوان بویت.

بەیانی پەیوەندیم بە سەرکارەکەمەوە کرد کەوا ناتوانم بێم بۆ کار پێویستم بە مۆڵەتە.

لەگەڵ دراوسێکەمان چووین بۆ پێشانگا جوانترین ئۆتۆمبێلم هەڵبژارد نرخەکەشی باش بوو بەقەد ئەو پارەیەبوو ئێمە هەمان بوو گرێبەستم نوسی واژۆم کرد ئۆتۆمبێلەکەم بردە جوانکاری قردێلەی سورم لە دەسکەکانی دەرگاکەی بەست، ناویم پڕ کرد لە دەبدەبەی بچووکی رەنگاو ڕەنگ بۆ ئەوەی دەرگاکەی کردەوە شۆک بێت بە دیتنی فڕینی دەبدەبەکان، ڕازاندنەوەیەکی جوانم بۆ کرد سویچەکەشم خستە نێو سندوقێکی تایبەت، ئۆتۆمبێلەکەم بردە پاڕک چادرێکم بەسەرادا گەڕامەوە ماڵ بۆ ئەوەی نانی ئێوارە لەدەرەوە بخۆین دایکم رەتی کردەوە بێت گووتی:

ئەو خۆشیە تایبەت بەئێوەیە بڕۆن چێژ لەو ژەمە ببینن.

لە خواردنگەیەکی نزیک پاڕک دانیشتین ژاڵە زۆر تاریفی دانیشتنەکەی کرد وایزانی دیاریەکە بریتیە لە ژەمە خواردنێک!

پاش نانخواردن پیاسەی پاڕکمان کرد بەرەو گۆڕەپانەکە چوین لە دووری ١٠٠ مەترێک لە بەرامبەر ئۆتۆمبێلەکە وەستاندم دەستم خستە گیرفانم سندوقەکەم دەرهێنا پێم گووت: ئەمە دیاری منە بۆتۆ.

گووتی:

+ ئای خوایە، زێڕت بۆ کڕیوم.

– نـــا، سندوقەکەم دا دەستی ویستی بیکاتەوە، گووتم: جارێ مەیکەوە.

دەستم بگرە چاوەکانت داخە لەگەڵم هەنگاو هەڵێنە، تا پێش ئۆتۆمبێلەکە نەوەستاین، دەستم بەردا.

گووتی:

+ چاوم بکەمەوە؟

– نـــا، تا پێت نەڵێم مەیکەوە.

چادرەکەم هەڵگرت گووتم:

چاوە گەشەکانت هەڵبێنە.

شۆک بوو واقی وڕما باوەڕی نەکرد، گووتم: سندوقەکەی دەستت بکەوە.

سویچەکەی بینی خەریک بوو لەخۆشیا بقیژێنێ، فەرمووم لێکرد دەرگا بکاتەوە بۆ ئەوەی شوفێری بکات ئەو هەموو دەبدەبە بەڕویدا فرین لەخۆشی دا گریا.

بە شەقامەکانی شاردا گەڕاین وەک دوو شێت بەیەکەوە هاوارمان دەکرد، نازانم خەڵکی لەدەرەوە گوێیان لە ئێمە دەبوو یا نا، بەڵام بەجۆرێک سەیریان دەکردین حەتمەن شتێکی نامۆیان لە ئێمە دەبینی.

لە پڕ ژاڵە گووتی:

+ دایکت!

- دایکم چیەتی؟

+ بۆچی ئەومان لەگەڵدا نیە؟ بۆ پێت نەگووت ئۆتۆمبێلت کڕیوە؟

- ئەو هەموو شتێک دەزانێ، کاتێک داوامان لێ کرد بەشدار بێت لەگەڵمان گووتی: چێژ وەرگرن ئەوە تایبەتە! پێشتر هەموو شتێکم پێ گووتبوو نەیویست بەشدار بێت تا ئازادانە هاوار بکەین خۆشی دەر بڕین.

گەڕاینەوە ماڵ هەردوو بە دڵخۆشی دەم بەخەندە و پێکەنین دایکم ئێمەی بینی پیرۆزبایی لە ژاڵە کرد ئەوسا گووتی: قەدری خۆشیەکان بزانن چونکە کاتین و تێپەڕ دەبن لە داهاتوو حەسرەت دەخوازن بگەڕێنەوە بۆ یەک چرکە ساتی ئەم خۆشیانە؛

کەمێک وەستا خوزیەکی قوتدا گووتی: تاقە خۆشیەک ماوە پێی بگەم دیتنی نەوەکەمەوە.

گووتم:

تۆ دەزانیت خەریکە نەوەیەکی نوێت بۆ زیاد دەبێ؟

پیکەنی و گووتی:

من دایکم هیچ شتێکم لێشاراوە نیە.

واقم وڕما!

گووتی:

بزانە کوڕەکەم هەموو دایکێک ئاگادارە بە کارە ورد و درەشتەکانی ماڵ و منداڵی.

پرسیم چۆن ئەو هەموو کارە نهێنیە دەزانیت، کێ پێت دەڵێ؟

گووتی:

زۆرن ئەوانەی کارەکانم بۆ ئاشکرا دەکەن..

روخسارەکان، رەفتارەکان، شێوازی دەربڕینی قسەکان، زۆربەی جاریش لێوەکان خۆیان بەگوێم دا دەچپێنن.

ژاڵە بە دایکمی گووت:

– وەرە بڕۆین سەیرێکی ئۆتۆمبێلەکە بکەین پیاسەیەک بکەین.

گووتی:

+ زۆر ماندووم کەمێک سنگم ژان دەکات ناتوانم چێژ لە پیاسەو خۆشی ئۆتۆمبێل ببینم، بەیانی سەیری دەکەم سەردانی ماڵی کاکەی ئادەمیش دەکەین.

بەیانی داهات ژاڵە بردمیە سەرکار ئەوسا چووە دەوام پاش نیوەڕۆش زووتر دەوامی تەواو دەبوو هات بەدوامدا کاک دیار دیتی، گووتی:

+ خێزانەکەت چاک بۆتەوە؟

– بەڵێ، سوپاس بۆ خودا.

+ کەوایە کاتی دەوامت دەکەینەوە بە ٤ی ئێوارە.

– لە راستی دا بڕیار بوو خۆم پێت بڵێم.

+ کێشە نیە ئەمڕۆش زوو بڕۆوە ماڵ، لە شەممەی داهاتوو کات ٤ کارەکەت تەواو دەبێ.

- زۆر سوپاس بۆ ئەم هەموو هاوکاریە، خودا پاداشتی بەخێرت بداتەوە،ماڵئاواییم لێکرد.

لەگەڵ ژاڵە گەڕاینەوە ماڵ دایکم خەریکی خۆ ئامادەکردن بوو بۆ ماڵی کاکم تا ئێمەش پشوویەکی کورتمان دا کات گەییە نویژی عەسر، گووتم: دەڕۆمە مزگەوت لەوێ نوێژ دەکەم ئەوسا دەڕۆین.

لە ریزی دواوە وەستام بۆ نویژ، نەگەیشتمە مەلا تا پێی بڵێم پیرە پیاوەکە چی زانستێکی فێر کردی.

گەڕامەوە روخساری دایکم بەلاوە ئاسایی نەبوو پرسیم نەساغیت؟

وەک هەمیشە خەندەیەکی بۆ کردم گووتی:

شتێکی وانیە بیری منداڵەکانم دەکەم پەیوەندیم پێوە کردوون هەموویان لای کاکت کۆدەبنەوە پێم خۆشە هەمووان ببینم.

بۆ ماڵی کاکم شوفێریم کرد دایکم لە تەکمەوە دانیشت ورتەی نەکرد هەرچەندی دەمدواند بە وشەیەک زیاتر نا، وەڵامی دەدامەوە وام هەست کرد تامەزرۆیی دیتنی خوشک و براکانم وا بێخوڵقی کردبێ، پاش مردنی باوکم دوو سێ جار ئەوانی دیتبوو، کەسیان سەردانی نەدەکرد.

گەیشتینە ماڵی کاکم پڕ بوو لە خوارزا و برازا هەمووان لەوێ بوون ئێمەیان بینی بەرەو ڕووی دایکم رایان کرد لە باوەشیان دەگرت دەستیان ماچ دەکرد بە نۆرە، منداڵەکان زۆر تامەزرۆی دایکم بوون هەموانی ماچ کرد فرمێسک لە چاوەکانی دەڕژا، لە بنەبانی دیوەخان دانیشت کچ و کوڕ و نەوەکانی بە دەوریەوە بە شێوەی سوننەتی دانیشتین سەرنجم دابوێ زۆر ورد سەیری تاک بەتاکی هەمووانی دەکرد.

بۆ خوانی ئێوارە تەنها مڵاکی لە شێوەکە وەردەدا خۆی دەخافڵاند هیچی نەخوارد!

بەدرێژایی کات خەندەی لەسەر لێوان بوو بەڵام لە دڵەوە نەبوو دەسکرد بوو.

کات تێپەڕی گەییە نۆی شەو خوشکەکانم لەگەڵ مێرد و منداڵیان گەڕانەوە ماڵ براژن و براکانیترم بە هەمان شێوە کاکەشم بێ تاقەتی پێوە دیار بوو حەزی دەکرد پشوو بدا لێ شەرمی دەکرد بە دایکم بڵێ خەوم دێ بۆیە ڕووم لە دایکم کرد گووتم: درەنگی شەوە بەیانی هەینیە پێویستە بڕۆینەوە ماڵ.

براژنم باشتر بوو لە کاکەم گەرموگوڕ بوو لە داواکردنی مانەوەمان بەڵام دایکم قبوڵی نەکرد ماڵئاواییمان کرد.

لە ڕێگا بە دایکم گووت: بۆچی ئەوها بێ خولّق بووی؟ هیچ شێوت نەخوارد! تەنانەت گلاسێک ئاویش بە قورگتدا نەچوە خواری؟

چاوی داخست فرمێسک جۆگەڵەی بەست بەسەر رومەتی‌دا بێ دەنگ گریا تا گەڕاینەوە ماڵ کەسمان قسە لەدەممان نەهاتە دەر.

تا درەنگی شەو لەگەڵ ژاڵە باسی ئەو منداڵەمان کرد کەوا هێشتا نەهاتۆتە دنیا بە خەیاڵی خۆمان داهوتویەکی گەشی بۆ بنیاد دەنێین بەدەم ئەو خەیاڵانەوە خەوم لێکەوت کاتێک واگاهاتم کات دەی بەیانی بوو خێرا خۆم شۆرد جلی ئوتوکراوم پۆشی عەتری میسکم بەکارهێنا، سیواکم کرد تەواو خۆم ئامادەکرد بۆ مزگەوت.

مەلا هەموو هەینیەک کاتژمێرێک زووتر دەهاتە مزگەوت دادەنیشت نوێژ خوێنەکان بەدەوری کۆ دەبوونەوە ئەگەر پرسیاریان هەبوایە

دەستیان هەڵدەبڕی، وەڵامی دەدانەوە، ئەم نەریتەی مەلا زۆر بەسود بوو بارتەقای وتاری هەینی زیاتر زانیاریت دەبیست فێری وەڵامی ئەو پرسیارانە دەبووی پێشتر گرێ بوون نەدەکرانەوە.

گەنجێک دەستی هەڵبڕی پرسیاری کرد گووتی:

بۆچی بێ باوەڕان پرسیارەکانیان دەگەڕێتەوە سەر یەک سەرچاوە؟

واتە: بۆچی هەموویان لە چوار چێوەی چەند پرسیارێکی دووبارە دەخولێنەوە؟

مەلا تەماشایەکی ئامادەبوانی کرد مایکەکەی بەردەمی کەمێک نزیک کردەوە گووتی:

بێ باوەڕان، چونکە بیر ناکەنەوە هەرگیز ناگەن بە پرسیارێکی نوێ بۆیە هەموو پرسیارەکانیش دووبارەن بنەڕەتیان دەگەڕێتەوە سەردەمی پەیامبەران، ئەوکات ئەهریمەن بۆ بەلارێ دا بردنی خەڵکی و دوور خستنەوەیان لە دین و پەیامی خودا، ئەو پرسیارانەیان دەخستنە دڵو توشی وەسواسی و هەڵگەڕانەوەیان دەکردن، لەسەردەمی ئێستاشدا بەتایبەت بێ باوەڕانی کورد هیچی نوێیان پێ نیە شیانی وەڵام بێ.

کۆتایی بە دانیشتن هێنا بانگی هەینی درا وتار دەستی پێ کرد لەسەر مینبەر گووتی:

قورئان گەورەترین «دەرئاسای» سەر زەویە تاقە کتێبە وەپێش و پاش رووداوەکان کەوتوە هەردوو زەمەنی گێڕاوەتەوە بێ کەموکوڕی زۆر ورد لەسەری دواوە لە دروست بوونی زەوی و نیشتەجێ کردنی مرۆڤ لەسەری تا کۆتایی بوونەوەر ئاماژەی بە نیشانەکانی رۆژی دواییش داوە.

ئەم قورئانە بەڵگەیە بۆ پەیامبەرێتی محمد ﷺ دەرئاساییەکەی وایکردوە هەندێک زانا گەورەکانی جیهان باوەڕ بێنن شایەتی بدەن بەوەی ئەم کتێبە بەدەرلەئاساییە دەستنوسی مرۆڤ نیە.

کۆتایی بە وتارەکە هێنا بێ ئەوەی ناوی هەندێک لە زاناکان ئاشکرا بکات.

بۆ نوێژی عیشا لێم پرسی بۆ ناوی یەک زانات نەهێنا؟

گووتی:

+ وای دابنێ ناوی گشت زاناکانم خوێندەوە، هیچ لە ئیمانی ئەو خەڵکە دەگۆڕێ؟

پێت وایە دەڕۆن بەدوای زانیاری و چۆنیەتی موسڵمان بوونی زاناکان دەکۆڵنەوە؟

ئەوانە خولەک دەژمێرن تاوەکو وتاری هەینی تەواو بێ و نوێژەکە لەکۆڵ بکەنەوە زوو بگەڕێنەوە ماڵ.

– پێت وانیە هەڵە لە ئێوەی مەلایە نەتانتوانیوە کرۆکی پەرستش بە خەڵکی ئاشنا بکەن؟

+ بەشێکی زۆر خەتای مەلای تیایە بەلام بەگشتی خەتای خۆیانە نافامن نایانەوێ فێر بن، پەرستشێکی لاسایی ئەنجام دەدەن ئەمەش وەک بار لەسەر شانیان قورسە زوو لە کۆڵ خۆیانی دەکەنەوە.

– ئێوەش دەزانن خەڵکانێک هەن پەرستش وەک بارێک بەسەر شانیانەوە تەماشا دەکەن؟

+ بەڵێ.

– پەنا بەخوا.

ئۆباڵەکەی بە ئەستۆی ئێوەیە چی وەڵامی خودا ئەدەنەوە لە ڕۆژی دوایی کاتێک لێتان دەپرسێتەوە ئێمە زانستمان فێر کردن بۆچی بە گوێرەی پێویست بە خەڵکتان ئاشنا نەکرد؟

+ سەبارەت بەخۆم سیاسەتی زانست بەخشینم بەخەڵکی گۆڕیوە، لە ڕێگەی تەکنەلۆژیاش بەشێکی زۆری کولتوری عەرەبم لە دین دەرهێناوە بەشێکی زۆر لەو فەرموودانەی بەناوی پەیامبەر بڵاو کرابوونەوە هەموویم بۆ خەلکی روون کردۆتەوە، جاران وتاری تایبەتم لەسەر دابوو خەلکم بەلاڕێدا بردبوو چونکە منیش فریوم خواردبوو.

کەسێک هات سلاوی کرد گووتی:

دەمێکە چاوەرێم گفتوگۆی ئێوە تەواو بێت پرسیارێکم هەبوو.

زۆر داوای لێبوردنم لیَکرد بۆ ئەو چاوەڕوانیە، ئەوم لەگەڵ مەلا بەیەکەوە جێ هێلا گەڕامەوە ماڵ دایکم خەوتبوو!

قەت وەها زوو نەدەخەوت نازانم باش نەدەهاتە پێش چاوم.

بۆ نوێژی بەیانیش هەڵنەستا ویستم بانگی بکەم ژاڵە گووتی: رەنگە نەخۆش بێت لێی گەڕێ با پشوو بدات.

ساتەکان بەهێواشی تێپەڕ دەبوون پێچەوانەی ترپەی دڵی من، کات خۆی گەیاندە حەوت هێشتا واگا نەهاتبوو! بێ ئەوەی بیر بکەمەوە خێرا دەرگای ژوورەکەیم کردەوە بەتانیم لەسەر روخساری لادا زەرد هەڵگەڕابوو بانگم کرد دەستم لێدا هیچ وەلامی نەبوو ژاڵە هات سەیری کرد واقی وڕما لەترسا سپی هەڵگەڕا نوتقی گیرا ویستی شتێک بڵێ،

چاوەڕێ نەبووم وشەیەک لەدەمی بێتە دەر بە پەلە باوەشم پێدا گرت خستمە ناو ئۆتۆمبێل گەیاندمانە نەخۆشخانە ژاڵە زوو هەستی

کرد هەموو شتێک کۆتایی هاتووە بەشێوەی ناراستەوخۆ دەیەویست شتێک بڵێت کەچی نەیدەتوانی حاڵیم بکات لە بارەی دایکم، دواجار گووتی: پێویستە پەیوەندی بە خوشک و براکانت بکەی بێن خزمان کۆ بکەینەوە..

بۆم دەرکەوت تەواو ئیدی دایکم مردووە!

حەزم دەکرد بگریم هاوار بکەم هەموو شتەکانی دەورم تێک بشکێنم بەڵام هیچ تواناییەکم نەبوو دنیا لەپێش چاوم تاریک بوو..

ماوەی نیو کاتژمێر بێهۆش کەوتبووم کاتێکیش خەبەرم بویەوە قیژو هەرای خوشکەکانم دەبیست بەسەر تەرمی دایکمەوە نوسابوون دەگریان!

براکانم دەستیان خستبووە سەر چاویان سەریان خستبوە سەر ئەژنۆیان بە دانیشتنەوە لەپاڵ دیواری نەخۆشخانە دەگریان!

خزمان حەیران مابوون لە دلسۆزی و ئەم سوێ زۆرەی خوشکوبراکانم بۆ دایکمیان هەبوو!

لە گۆڕستان کاتی ناشتنیش ڕسابوونەوە دەیانگووت دەبێ ئێمەش بنێژن با لەگەڵ دایکمان بڕۆینە بن گڵ، خۆڵیان بەسەر خۆیاندا دەکرد..

خاڵم دیتی هیچ کاردانەوەم نیە وەک خوشک و براکانم، هاتە لام گووتی: نازانم ئەو خوشکەی من چی لەتۆ دیبوو ئەوها گیرۆدەی تۆبوو، خۆزگە ئێستا دەیبینی چەند بێ باکیت بە مردنی،

حەیف تۆ کوڕی ئەو ژنە بویت.

خاڵم کەسێکی خۆشباوەڕ بوو هەستی بەو سیناریۆ و نمایشەی خوارزاکانی نەدەکرد

ئەوان زۆر لێزان بوون لە خۆنوادن و نمایش کردن و بزواندنی سۆزی ئامادەبووان، خاڵم

نەیدەزانی ئاگادار نەبوو خوشک و براکانم چەند لەدایکم بێزار بوون، گووتی: تۆ دڵت هەیە؟

باوەڕناکەم چاویشت هەبێ!

ئەسڵەن هەر لە مرۆڤ ناچیت..

مەرگی دایکت لەگۆڕێیە هیچ خوستت نیە وەک بێگانەیەک وەستاوی سەیر دەکەیت.

هیچ وەڵامم نەدایەوە

تاقەتی نمایش و سیناریۆم نەبوو بۆ فریودانی دەوروبەر

چونکە باکم بە هەڵسەنگاندنی کەس نەبوو بۆ کەسایەتیم

،،خودا و دایکم لەهەموو کەس باشتر من دەناسن،، ئاتاج بە خەڵکی نیم چۆن لەبارەمەوە دەدوێن.

پرسەمان دانەنا لەسەر وەسیەتی دایکم هەرکەس چوینەوە ماڵی خۆمان هەموان گەڕانەوە ماڵیان ئاوەدان بۆوە تەنها من نەبێ، رۆیشتمەوە ماڵم بە وێرانەیی هاتە پێش چاو حەفتەیەک لەو ژوورە نوستم لەسەر ئەو پێخەفەی دایکم لەسەری دەخەوت جلەکانیم لەتەک خۆم راخست شەوان بۆنم دەکرد بەدەم گریانەوە خەو دەیبردمەوە.

بە تێپەڕ بوونی کات خەریک بوو ڕادەهاتم بەنەبوونی دایکم.

دوای هەشت مانگ ژاڵە یەکەم ژانی منداڵ بوونی گرت.

منداڵێک هاتە دنیا هەرگیز ئەو ڕۆژەم بیر ناچێت کاتێ لەحەوشەی نەخۆشانە چاوەڕێ بووم خەسوم هات کۆرپەکەمی لەباوەش بوو نیشانی دام نەمتوانی لێی وەرگرم لەباوەشدا هەڵیگرم ماچی بکەم ئەوەندە گریام سەرم خستبوە سەر سوکان فرمێسک تنۆک تنۆک دەرژایە سەر ئەژنۆم.

دایکی ژاڵە گووتی:

بۆ دەگریت؟ کوڕێکی جوانتان بووە! حەق وابوو لەخۆشی ئەوەی بویت بە باوک شیرینی ببەخشیتەوە.

بەردەوام بووم لە گریان هیچ وەڵامم نەدایەوە، ئەویش گریا کۆتاجار پرسیاری کرد لەبەرچی دەگریت؟

گووتم: دایکم ئاواتی ئەوەبوو ئەم منداڵە ببینێت تا زیندوو بوو منداڵ نەبوو ئێستا منداڵ هەیە دایکم بوونی نیە.

گووتی:

بەوە دەڵێن «قەدەر» یەکێک لە بنەماکانیشی ڕاگرتنی هاوسەنگی ژیانە لەڕێگای لە دایک بوون و مردن.

دەرگای ئۆتۆمبێلەکەی کردەوە بڕوات گووتم: بوەستە دەمەوێ منداڵەکەم ببینم و لەبری دایکم ماچی بکەم.

هەستێکی چەند سەیر بوو! دڵم نەدەهات توند بە دڵمەوە بینوسێم، نەرم لێوەکانم نا بە نێوچەوانی ماچم کرد.

زۆر هەوڵمدا ئەو کاتە بنوسمەوە کە بۆ یەکەم جار دەبیت بە باوک کۆرپەکەت لەباوەش دەگریت (ئای خودا چ هەستێکە)، بەڵام هەرچی

گەڕام ئەو پیتانەم نەدۆزیەوە بیانکەم بە وشە و ڕستە، ئاماژە بدەن بەو ساتە.

حەفتەی یەکەم خەسوم هات لەماڵ خزمەتی ژاڵەی کرد ماڵەکەمانی ئاوەدان کردبوو

ڕۆژی دووەم منداڵەکەم لەگەڵ خەسوم بردە سەر گۆڕی داپیرەی تەنها نیو کاتژمێرماینەوە لەبەر حاڵی ژاڵە کە تەنهابوو لەماڵ پێویست بوو بڕۆینەوە دایکی ژاڵە گووتی: ئەم کۆرپە ناسکە بەرگەی ئەم کەشوهەوا گەرم و وشکەی گۆڕستان ناگرێ. گەراینەوە ماڵ، ژیان ئاسایی بوو هەموو شتێکی ماڵ پاش هاتنی ئەم منداڵە؛ چێژێکی تایبەت بەخۆی هەبوو.

خەسووم وەک دایکم بەیانیان زوو هەڵدەستا خواردنی ئامادە دەکرد بەدەم پێکەنینەوە بەڕێی دەکردم بۆ سەر کار، خەریک بوو هەستی بێ دایکیم لەبیر دەچۆوە زۆر پێی دلخۆش بووم وامدزانی خودا بە دیاری بۆی ناردووین، ئەم خۆشیەی هەبوونی خەسوو لەماڵی ئێمە دا هەر حەفتەیەکی بڕ کرد  خەزورم هات گووتی:

ئەو ماوەیە ماڵەکەم وەک وێرانەی لێهاتوە؛ هاتووم دایکی ژاڵە بەرمەوە تا ئاوەدانی بکەوێتەوە ماڵ و دڵ و دەرونی من

ئێستا تەندروستی ژالەش باشترە دەتوانێ خزمەت بەخۆی بکات، تۆش وردە وردە هاوکاری بکە.

ڕۆیشتن بەیەکەوە گەڕانەوە ماڵی خۆیان سەیرێکی حاڵی ماڵی خۆمانم کرد ئافرەتی گەورەی تێدا نیە! هەستم نەدەکرد لە ماڵێکی «تەواو» بێ کەموکوڕی دەچێ.

لەوەوە بۆم دەرکەوت ئافرەت هەتا زۆرتر بە تەمەن دا هەڵکشێ قەدری زیاتر دەبێ بەلای ئەو مێرد و منداڵە موسڵمانەی کەوا پەیڕەوی تەواوی بەرنامەی ئاییني ئیسلام دەکەن.

له حەفتەی سێیەم مناڵەکەمان ناو لێنا، لەسەر ئارەزوی دایکی ناوی «شاد»ی پێ خۆشبوو پێناسمان بۆ دەرهێنا.

یەکەم ئامانجی ئێمە بۆ پەروەردە کردنی شاد ئەوە بوو بیکەین بە کەسێکی سوود بەخشی کۆمەڵگا بۆیە گەورەبوونیمان کرد بە سێ قۆناغ واتە بۆ سێ دەیە..

لەسەرەتای قسە کردنی تاوەکو تەمەنی دە ساڵی دەبوو قورئانی پیرۆز دەرخ بکات.

لە دەیەی ناوەراست واتە تا دەگاتە بیست ساڵی دەرخ کردنی فەرموودە نەمرەکان ئەوانەی بەردەوام لەناو کۆمەڵگا پێویستن کاریان پێ دەکرێ لەگەڵ بەرز کردنەوەی ئاستی رەوشت بەپێی سەردەم و کلتوری کۆمەڵگە.

لە دەیەی سێیەم

قۆناغێکی پڕ گۆڕێنکاری دەبێت لە ژیانی دا ئەوکات خۆی سەرپشک دەبێ لەوەی چۆن ژیانی هەڵبژێرێ و برەوی پێ بدا خزمەت بە کۆمەلگای بکات لە رێگای دینداریەکەیەوە.

ڕەنگە لەو قۆناغەی کۆتایی پرسیاری ئەوە بێتە ئارا بگووترێ:

هەڵەیە تۆ بیست ساڵ بەرنامەی ئاینێک بئاخنیت بە مێشکی منداڵەکەت! ئەوسا سەرپشکی بکەی لەوەی ئازاد بێ چۆن بژیەت و خزمەت بکات...؟

لە وەڵامی ئەم جۆرە پرسیارە دا بە بزەیەکی سەر لێوانەوە دەڵێم:

هەموو دایک و باوکێک باشترینی شتەکانی ژیانی بۆ منداڵەکانی دەستەبەر دەکات، دەی ئایینی ئیسلامیش باشترینی بەرنامەکانی هەموو دنیایە.

کات تێپەڕی مۆڵەتی پشووی دایکایەتی ژاڵە لە تەواو بوون دابوو، بەخێو کردنی شاد لە دایەنگایەکی باش و پڕ لە سۆز کەمێک قورس بوو، پەیوەندیم بە چەندین شوێن کرد

هیچیان مەرجەکانی ئێمەی تێدا نەبوو تا منداڵەکەمان بنێرینە لایان.

بیرۆکەی دروست کردنی دایەنگەم کەوتە مێشک.. لەگەڵ ژاڵە باسم کرد زۆری بەلاوە جوان بوو، گووتی: دڵنیام سەرکەوتوو دەبیت، ئەگەر مەرج بۆ دامەزراندنی دایەنەکانیش دابنێی واتە لەو ئافرەتانە بن کەوا دەرچووی بەشێکی پەیمانگا یاخود زانکۆی ئیسلامی بن زۆر گرنگ دەبیت متمانەی دایک و باوکان زیاتر وەدەست دێنی، بێ خەم دەبن لە رادەست کردنی کۆرپەکانیان بە دایەنگاکە، چونکە موسڵمان ئەمانەت دەپاریزن ڕێزی زۆریش لە نەوەی باوکەئادەم دەگرن گیانی خۆیانی بۆ دەکەن بە قوربانی.

بە ماوەی شەش مانگ پتر توانیم شوێنێک بۆ دایەنگاکە ئامادە بکەم و مۆڵەتیش لە حکومەت وەرگرم..

بۆ دامەزراندنی دایەن سەردانی چەند مامۆستایەکی پەیمانگا و زانکۆم کرد بۆ ئەوەی پەیوەندی بە هەندێ دەرچوی بەشەکانیان بکەن بێن لەلای ئێمە دامەزرێن هەر ئەو ڕۆژە سێزدە دەرچووی پەیمانگا ئامادەییان دەربڕی کارمان لەگەڵ دا بکەن.

لەم پڕۆژە سەرکەوتین، دوای دوو ساڵ بڕیارماندا فراوانتری بکەین لەسەر داوای دایکوباوکان باخچە دروست بکەین بۆ منداڵانی گەورە لە سێ ساڵ تا پێنج ساڵ.

بەهۆی دڵسۆزی دایەنەکان متمانەی خەڵکمان بەدەست هێنا لە بنیادنانی باخچەیەکی سەرکەوتوو.

لەوێ مامۆستاکان منداڵەکانیان فێر دەکرد کەی گوێ لە قورئان بگرن و یاری بکەن.

قۆناغی باخچەش بە سەرکەوتویی تێپەڕی.

بە هاوکاری خێرخواز و دەوڵەمەند و بانگخوازان توانیمان قوتابخانەیەکی ئیسلامی شەش پۆلی بچوک دروست بکەین.

لە کۆتاییدا زانکۆی ئیسلامی هاتە بنیاد

پرۆگرامی خوێندنمان لە وڵاتی سودان و سعودیە هێنا لەگەڵ زانایانی کورد هەوڵماندا کۆبوینەوە تاوەکو گونجاندمان لەگەڵ کلتورو نەریتی کورد یەکانگیر بێت، ئەوسا خستمانە قۆناغەکانی خوێندنی زانکۆ.

لەبەرئەوەی پرۆژەکە لە پێناو ڕەزامەندی خودا بوو هیچ پەیوەندی بە بەرژەوەندیەکانی تاک و گروپ نەبوو، هەمیشە سەرکەوتوو بووین.

حزبە ئیسلامیەکان زۆر هەوڵیاندا ببین بە بەشێک لەوان ئیمتیازی گەورەی حزبیان خستینە بەردەم، ڕازی نەبووین.

حکومەت بەو کارکردنە سەربەخۆیەی ئێمە زۆر دڵخۆش بوو پشتیوانی زیاتری دەکردین.

حزبە دەسەڵاتدارەکانیش زۆر جار ڕووی رەشی خۆیان بە ئێمە سپی دەکردەوە لەبەردەم چاوی کامێراکان هاوکاری قەبەیان دەکردین لەکاتی هەڵبژاردنە سیاسیەکان وەک دەستکەوت بەکاریان دێنا!

بەڵام هەرگیز ئەو کارانە نەبوونە هۆی ئەوەی ئێمە متمانەمان لەدەست بدەین بەرامبەر موسڵمانان چونکە پەیامی ڕوون و ئاشکرای ئێمە دیار بوو، بەو هەڵوێستە ڕیابازیەی حزبە سیاسیەکان لێڵ نەدەبووین.

بەهۆی ملنەدان و لاگیری نەکردمان بۆ هیچ تاقم و گروپێکی سیاسی باجی زۆرمان بە کەسایەتی خۆمان دا لە پێناو بە لاڕێدا نەبردنی پڕۆژەکەمان کە ئامانج لێی رەزامەندی خودا بوو.

ناتۆرەی زۆریان لێدەنایین بوختان و درۆی وایان بەدەمەوە دەکردین!

ژاڵە دەکەوتە گومان کێشەی دروست دەکرد لە ماڵ، بۆم دەسەلماند بوختانە ئەوسا سارد دەبویەوە؛ متمانەی زۆری بەمن بوو بەڵام درۆکان بەجۆرێک بنیات دەنران خۆشم دەکەوتمە گومان لەخۆم ئەوەندە ژیرانە روداوەکانیان دروست دەکرد.

دوای هەژدەساڵ کۆرپەکان ئاهەنگی دەرچونیان لە زانکۆ گێڕا، بەشێکی زۆریان بە هاوکاری ئێمە یەکدیان ناسی هاوسەریان پێکهێنا.

هەمووان وەک خێزانێکمان لێ هاتبوو لە کۆرپەیی تا دوا قۆناغی زانکۆ بەیەکەوە دەژیاین، ئەوەی لە کۆتا ساڵی خوێندن ناونرا بوو ئاهەنگی دەرچوون بەلای ئێمە وەک پرسە وابوو.

لە دە خوێندکارە یەکەمەکان هەر لە زانکۆ و خوێندنگەو دایەنگە دادەمەزران، هەلی کارمان بۆ ئەوانیدیش دەرەخساند کوڕەکان بەشێکیان دەبوون بە بانگخواز و مەلای مزگەوت، مامۆستای زمانی عەرەبی و

ئایین، کچەکانیش زۆرینەیان دەبوون بە مامۆستا لە خوێندنگە تایبەتەکان، کەمینەیەکیان کەوا ژمارەیان لە پەنجەی یەک دەست تێپەڕی نەدەکرد دەبوون بە بانگخواز لای حزبە ئیسلامیەکان دەست بەکار دەبوون.

لەم هەموو ساڵەی خزمەت کردن لە زانکۆ تاقە شتێک هەرگیز بیرم ناچێتەوە، دیبەیتی نێوان شەش خوێندکاری ئێمەی ئیسلام بوو لەگەڵ شەش خوێندکاری زانکۆی حکومی کەوا هەر شەشیان مارکسی بوون.

لە پێشدا وا ڕێکەوتبوون پرسیارەکانیان ئاڵوگۆڕ کردبوو تا وەڵامی گونجاو و قەناعەت پێکەر بدۆزنەوە..

کاتێک پرسیاری مارکسیەکانیان بۆ من هێنا سەیرێکم کرد هیچی نوێی تێدا نەبوو هەمووی دووبارە بوو، ترسم نەبوو لەوەی سەرکەوتن بۆ خویندکارە موسڵمانەکان دەبێت چونکە دکتۆر و مامۆستاکان هاوکار و هاندەریان بوون لە وەڵامی دروست.

مێژووی دیبەیتەکە ڕۆژی پێنج شەممە بوو دوای نوێژی عەسر لە هۆڵی گەورەی زانکۆ، میوانەکان ئەوەندە زۆر بوون لە هۆڵەکە جێگە تەنگ بوو.

خوێندکارێکی مارکس نۆرەی هات قسەی کرد، پاشان پرسیارە دووبارە سواوەکەی کرد گووتی:

ئەگەر خودا بوونی هەبا بەر لەوەی لەدایک بواین پرسی پێ دەکردین؟

هەرگیز چاوەڕوانی وەڵامێکی لەو جۆرەم لە خوێندکاری خۆمان نەبوو!

دەمانچەیەکی لە نێکی دەرهێناو خستیە بەردەمی و پێی گووت:

تۆ نارازیت بەو ژیانە، گلەیی لە هاتنە دنیات دەکەی، چونکە پرست پێ نەکراوە؟

فەرموو خۆت بکوژە ئەو ژیانە ڕەت بکەوە.

سەیری کاردانەوەی خوێندکارەکەم دەکرد ئاخۆ لەو دەمەدا هەڵوێستی چی دەبێ، بەڵام متەقی نەکرد هاوڕێکانیشی وەک ئەوەی ئەم کوڕە لە تەرەفی ئەوان نەبێ لە ژێر لێوان بە دزیەوە پێ دەکەنین، لە سەرەتاوە تا کۆتایی دیبەیت نەمبینی ئەوان پشتیوان و هاوکاری یەکدی بن گروپێکی ڕێکخراو نەبوون پێچەوانەی تیمی خوێندکارە موسڵمانەکانی ئێمە بوون.

زۆر دڵخۆش و گەش بین بووم بە نەوەی داهاتوو لە ڕێگاو ڕێبازی ئیسلام و پەیامبەر محمدﷺ برەو بە ژیان دەدەن، ئەو کۆمەڵگە کاول کراوەی لە رەوشت و بەها مرۆڤیەکان بەدەستی سیکۆلارەوە؛ دەبوژێننەوە بیری پوچ و وشکەهەڵاتوی بێ باوەڕان لە بن دێنن دووبارە ژیانی رەوشت بەرزی و ئاکارەکانی باوەڕداری دەگەڕێننەوە بۆ ناو تاک و خێزان و کۆمەڵگە.

رۆژانە وەک کارمەندێک لە زانکۆ دەوامم دەکرد هەرگیز ڕازی نەبووم بکرێم بە سەرۆکی زانکۆیەک زانای گەورەی تێدابێ لەچاویاندا بەقەد خوێندکارێکیش زانستم نەبوو، چۆن بتوانم ببم بەسەرۆکی زانای گەورەی ئایینی!

تەنها بەشی پارە لەدەست مندا بوو، پێش ئەوەی واز لە دەوام بێنم بە کۆی دەنگی مامۆستاو دکتۆر و زاناکان خۆم خانشین کرد سندوقی پارەی زانکۆشم رادەستی لیژنەی پێنج کەسی کرد.

ئێستا مانگانە موچەم بۆ دێننەماڵەوە، یاخود وەک سەردانێک دەرۆمە لایان و لە نزیکەوە هەواڵیان دەپرسم.

جاروبار لەماڵ بەتایبەت ئەو کاتانەی بێ تاقەت دەبم سەرێک لە یادەوەریە کۆنەکانم دەدەم لە نێو رەفەی کتێبخانەدا هەندێ یادگاری دەدۆزمەوە تۆزیان لەسەر نیشتوە هەڵیان دەگرم دەیانسڕمەوە چاوێک بە رووداوەکاندا دەخشێنم ئەوسا توند لە ئامێزم دەیگوشم بڕێک جار یادگاریەکان ئەوەندە قووڵ ڕۆ دەچن بە ناخی دڵمدا فرمێسک لەچاوما دەزێ.

کۆتا یادگاری زۆر کاری تێکردم تێنوسێک بوو بەرگەکەم هەڵدایەوە وێنەیەکی دایکم بوو لەوێ هەڵمگرتبوو

بە کوڵ گریام لەگەڵ دەنگم ژاڵە بەخێرایی و واق وڕمانەوە هات وێنەکەی لێوەرگرتم تەماشایەکی کرد نوتقی گیرا بەڵام ئەو بەسەر خۆیدا زاڵ بوو نەگریا ژوورەکەی بەجێهێشت بە گلاسێک ئاو گەڕایەوە لەگەڵم بوو تا ژیری کردمەوە ئەوسا گووتی:

نابێ منداڵەکان گریانی باوکیان ببین چونکە کاریگەری خراپ لەسەر دەرونیان دروست دەکات.

ئێمە چوار منداڵمان هەبوو دوو کوڕ و دوو کچ بە ناوەکانی (شاد، ئاسا و سارین، شەنگ)

شاد و ئاسا کوڕەکانمن شاد گەورەترە دوای ئەوان سارین لەدایک بوو شەنگیش بچوکترینی ماڵە

لە کۆرپەییەوە رادەستی دایەنگاکەی خۆمان کردن لەگەڵ گەورە بوونیان پۆلەکانی خوێندنیان بەسەرکەوتویی بەڕێکرد لەژێر دەستی مامۆستا دڵسۆزەکان.

جیاوازی نێوان تەمەنی منداڵەکان سێ ساڵ بوو واتە هەر سێ ساڵ جارێک خودا منداڵێکی پێ دەبەخشین.

ژاڵە گووتی:

ئەو تێنوسە چی تێدا نوسراوە بمدەیە سەیرێکی بکەم؟

گووتم:

کاتێ گەنج بووم حەزم دەکرد وشەکان کۆ بکەمەوە ئەوسا ڕیزیان بکەم یا بڵێم لە تافتەیان بدەم جوان و باشەکان هەڵبژێرم جودایان بکەمەوە بیانکەم بە ڕستە ئەگەریش گونجا چاپی بکەم.

سەیرێکی کردم، گووتی:

باش بوو چاپت نەکرد ئەگەر بەم کتێب و وشەو پیت چنینەوە سەرقاڵ بوای هەرگیز نەتدەتوانی ببیتە خاوەنی پڕۆژەی پەروەردەیی کەوا بەقەد هەموو ڕۆمانەکانی دنیا سودی بە مرۆڤ گەیاندوە.

هیچ وەڵامم نەدایەوە بە پێچەوانەی ئەو تێنوسەکەم هەڵدایەوە هەموویم خوێندەوە تا گەیشتمە ئەو دێڕەی دەڵێ:

(پەرستاریکی گەنج هات پشکنین بۆ باوکم بکات کچێکی جوان بوو هەر زوو برازاکانم لێی کەوتنەخۆ) ئەو دێرە منی گەڕاندەوە نزیکەی بیست و دوو ساڵ لەمەوبەر، ئەو چرکەساتەی بۆیەکەم جار ژاڵەم لە نەخۆشخانە دا بینی، ئەوسا بۆم دەرکەوت خودا دایکە حەوای بۆ خۆشی و شیرینی ژیان دروست کرد، ئەگەر ئافرەت لە فەرهەنگی ژیان بێنینە دەر پێناسەی ژیان دەبێتە تەنهایی، لەبەرئەوە ئێستاش بەهەمان گڕوتینی لاویەتی ژاڵەم خۆشمدەوێ نازی هەڵدەگرم لەبەر چاوی منداڵەکانم دەستە ماندووەکانی ماچ دەکەم بۆ ئەوەی هەست بکەن دایکیان چەند ئافرەتێکی گەورەیە لە ژیانی مندا.

پێنوسێکم لەسەر مێزی نزیک کتێبخانەکە هەڵگرت بەهەمان زەوقی لاویەتی دەستم بە نوسینی وشە جوان و دانسقەکان کرد بۆ تەواو کردنی «رۆمان»ـەکە.

تا درەنگانی شەو خەریکی چنینی وشەکان بووم.

خەیاڵم ڕۆیی بەرەو لای

خودا، پەیامبەر، قورئان، ئیسلام.

کەوتمە گفتوگۆ لەگەڵ خۆم گووتم:

– خودا چۆن بڕیاریدا مرۆڤ دروست بکات؟ ئاخر بە چی شتێکی ئێمە سەرسام بوو تا دروستمان بکات؟

– خودا تەقوا و پارانەوەو پەرستشی ئێمەی پێ خۆشە بۆیە دروستی کردوین، ئێمە کە لە بنەڕەتدا نەبووین چۆن پێمانەوە سەرسام بێت! خودی پرسیارەکەش هەڵەیە.

– پەیامبەر محمدﷺ کاتێک کانیاوی ئاو لە نێوان پەنجەکانی دروست بوو هاوەڵانی تێراو کرد! جۆری ئاوەکە جیاوازی هەبووە لەگەڵ ئاوی ئاسایی؟

– بێ گوومان جیاوازی هەبووە لە ڕووی تام و پیرۆزیەوە.

– قورئان کتێبێکە وشەکانی لەلایەن خودا نێردراوە. چۆن دەکرێ لەم کتیبە پیرۆزە جادوو بەرهەم بهێنرێ؟

– ئەوە کاری شەیتانە! قورئانی پیرۆز بەکار دێنێ کردویەتیە مەرج لەسەر جادووگەر کەوا دەبێ سوکایەتی بە قورئان بکات ئەوسا جادووەکەی بۆ دەکات، دەنا خودی قورئان هیچ جادوویەکی تێدا نیە.

– ئیسلام کۆتا ئایینی ئاسمانیە ئەی بۆچی ئەوەندە دژایەتی دەکرێ؟

– سروشتی مرۆڤ وایە هەموو شتێک بە دژەکەی دەناسێ، گەورە بوون و بڵاو بوونەوەی ئیسلام بەهۆی دوژمنەکانیەوە زیاتر پەرەی سەندووە.

چاوەکانم بڵند نەدەبوون خەوێکی قوڕس بەرۆکی گرتم چەند خولەکێکی کەمی مابوو بانگی بەیانی بدرێ ڕۆیشتم دەستنوێژ بگرم لەبەردەم دەستشۆرەکە بۆ چەند چرکە ساتێک خەوم لێکەوت بە دەنگی بڵندگۆی مزگەوت واگا هاتم دەستنوێژم گرت لەتەنبەڵی نەڕۆیشتم بۆ مزگەوت نوێژی بەکۆمەڵ ئەنجام بدەم لەماڵ کردم پاش هەندێ زیکر و تەسبیحات لەسەر جێگەدا ڕاکشام چاوەکانم لێکنا زۆر قوڵ خەوتم دەتگووت چەندین ڕۆژە خەو نەچۆتە چاوەکانم.

بانگی نیوەڕۆ بوو واگاهاتم کەس لەماڵ نەبوو هەموویان ڕۆیشتبوون بۆ دەوام، خێرا دەستنویژم گرت بەرەو مزگەوت هەنگاومنا.

کات دووی پاش نیوەڕۆ بوو هەموان گەڕانەوە، بەیەکەوە لەگەڵ ژاڵە خوانی نیوەڕۆمان ئامادە کرد بەشێوەی سوننەتی بەدەوری خوانەکە کۆبوینەوە، سەرنجم دا شاد ئاسایی نایەتە بەرچاوم لەبەرەخۆی قسەی دەکرد نوقرچێکم لە ژاڵەدا بە ئاماژەی سەر پێم گووت: سەیرێکی شادی کوڕت بکە.

بزەیەکی بۆ کردم چاوێکی لێ قوچاندم وەک ئەوەی بڵێ لێگەڕێ بۆ دوایی.

هەموان هەستیان کرد شاد ئاسایی نیە! لەبن لیوان بزەیان دەکرد خۆمم بۆ نەگیرا تا دوایی بەرگە بگرم یەکەوڕاست گووتم:

- شاد، کوڕەکەم چیتە؟ بۆ لەبەرخۆتەوە قسان دەکەی؟

+ هـا، ئاخر.. ئاخر هێشتا وەڵامی نەداومەتەوە.

زۆر شێوا بوو گووتم:

- کێ وەڵامی نەدایتەوە؟

+ ئـ. ئـ. ئەو..

- بۆ وا شپرزە شێواوی کوڕەکەم؟ «ئەو» کێیە؟

وەڵامی نەدامەوە شەرم دایگرت ڕەنگی سوور هەڵگەڕا بەخێرایی ڕۆیی بۆ ژووەکەی، خوانەکەی بەجێهێشت.

ژاڵە گووتی:

شاد لە زانکۆ کچێکی دەست نیشان کردووە دەیهەوێ هاوسەرگیری لەگەڵدا بکا، ئەوڕۆ کۆتا ڕۆژ بوو کەوا کچەکە وەڵامی ڕازی بوونی پێ بداتەوە، بەڵام دیارە وەڵامی نەداوەتەوە.

گووتم:

- بۆچی منیش لەو هەواڵە ئاگەدار نەبووم؟

+ ئەورۆ بەیانی بەمنی گووتوە دەنا منیش هەواڵم لەو کارە نەبووە.

- نەی وتووە کچەکە کێیە؟

+ بـا، گووتویەتی، چۆن نەی گووتوە! دەڵێ کچی سەرۆکی زانکۆیە.

خێرا مۆبیلم لە گیرفانم دەرهێنا پەیوەندیم بە سەرۆکی زانکۆوە کرد ژوانێکم لەگەڵ بەست بۆ پاش نویژی عیشا.

ئێستا مانگێک بەسەر ئەو ژوانەدا تێپەڕیوە ئێمە هەموومان لە هۆڵی ئاهەنگی بووک گواستنەوەین لەگەڵ باوکی بووکە خان بەیەکەوە دانیشتووین قسە لەسەر کردنەوەی لقێکی پرۆژە پەروەردەییەکە دەکەین لە شارێکیتر بە دایەنگە دەست پێ بکەین..

لەو قسانە دابووین، شاد هات سڵاوی کرد دەستی من و خەزوری ماچ کرد گووتی:

چاوەڕێین بێن لەو دیو وێنەمان لەگەڵ بگرن.

لەگەڵی ڕۆیشتین بۆ هۆڵی تایبەت بە ئافرەتان لەوێ بووکەخان دەستی من و باوکی ماچ کرد، شتێکی ناخۆش هاتەوە بیرم دڵە خورپە گرتمی ڕەنگم تێک چوو! ئێستاش لە وێنەکەدا پێمەوە دیارە ئاسایی نیم ڕەنگم تێک چووە.

سەرۆکی زانکۆ هاوڕێی لەمێژینەم بوو زوو هەستی پێکردم گووتی:

با بڕۆینە دەرەوەی هۆڵەکە کەمێک لەو ژاوەژاوە دوور کەوینەوە.

لە دەرەوە پێی گووتم:

+ چی شتێک وا ڕەنگی تێک دای؟ شتێک بووە؟

– نـــا، هیچ نیە.

+ بـــا، شتێک هەیە؛ ئەو روخسارەی بیست ساڵ زیاترە دەیناسم بێ ئەوەی قسە بکا لێی تێدەگەم دەزانم شتێکی لەناخدا هەیە.

– ئەوەی راستی بێت شتێک هەیە لە ناخم بەڵام گرنگ نیە.

+ چۆن! ئەسڵەن زۆریش گرنگە دەبێ بیزانم، چونکە تێکچوونی ئەو

روخسارە لەم کاتە دا ئاسایی نیە.

- هۆکارەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو کاتەی خەریکی هاوسەرگیری بووم دایکم هەمیشە پێی دەگووتم:

نامەوێ بمرم تا منداڵی تۆش دەبینم ئەوسا بشمرم قەینا، هەرگیز منداڵی منی نەدی ئێستاش من دەترسم بمرم و نەوەکەم نەبینم.

+ ئەوە ترسی بۆ چیە؟ یانی دەتەوێ لە پێناو منداڵێک ڕۆیشتن بۆ دیداری خودا دوا بخەی؟

- گرەنتی دیداری خودام نیە دڵنیا نیم ئاخۆ شایەن بە دیداری دەبم یا نا.

+ خودا چاکە کار و تۆبەکار و... هەموو ئەوانەی خۆشدەوێ بۆیە ئومێد بەدیداری ئەو لەدەست مەدە گەشبینبە خودا لەجێی گوومانی بەندەکەیەتی واتە چۆن گوومانی پێ ببەی بەوجۆرە دەبێ بۆت.

دوای یازدە مانگ..

لە زانکۆ بووم خەریکی ئامادەکاری بووین لەگەڵ مامۆستاو خوێندکارەکان بۆ مەراسیمێکی شایستەی ناشتن، شاد پەیوەندی پێوە کردم گووتی:

هەموو شتێک کۆتایی هاتووە کەی دەست پێ دەکەن؟

وەک سەرۆکی زانکۆ هەموو بڕیارەکان لەدەستی من بوو بۆیە گووتم: هەر ئێستا دەست پێ دەکەین.

بە هەموو خوێندکارەکانم ڕاگەیاند خاوەنی پڕۆژەی پەروەردەیی (لە دایەنگەوە تا زانکۆ) بەڕێز «ئادەم»

کۆچی دوایی کردوە هەرکەس لەگەڵمان دێ بۆ گۆڕستان وەک وەفایەک بەرامبەر ئەو خزمەتە گەورەی کردویەتی، پاس ئامادەیە دەنا لە نزاو پارانەوەکانتان بێ بەشی مەکەن..

ئێمە وەک دەستەی مامۆستاکان دابەش بووین بەسەر پاسەکان تەنانەت یەک خوێندکاریش نەگەڕایەوە هەمووی سەرکەوت لەگەڵمان، زیاتر لە پێنج هەزار کەس ئامادەی ناشتنی بوون بەشێکی زۆر لە بەرپرسی گەورە و پیاوانی حکومەت لە پێشی پێشەوە ڕیزیان بەستبوو لە تەنیشت گۆڕی دایک و باوکی بەخاکمان سپارد.

هەمووان لە ماڵی خۆیان یا لە ناخی دڵیان پرسەیان گێڕا.

دوو حەفتە پاش مردنی ئادەم سەردانی ماڵیانم کرد زۆر ئاسایی بوون! وەک ئەوەی هێشتا ئادەم زیندوو بێ لەناویان بێت، هەمیشە سوپاسی خودایان دەکرد لەسەر ئەو موسیبەتە.

ژاڵە گووتی:

تەنها ئەوەم لەدڵ گرانە نەیتوانی نەوەکەی ببینێ وەک دایکی چۆن شادی نەبینی، هەردوو بەو حەسرەتەوە مردن.

گووتم:

باسی ئەو ساتەم بۆ بکە کەوا ئادەم گیانی سپارد.

گووتی:

شەو لە ژووری خەو بووین دڵتەنگ و پەرێشان بوو هەرچەند یادی خودای دەکرد بەڵام دڵتەنگی ئەو نەساغی بوو نەک خەمباری، منیش نەمدەزانی، لەکۆتایی گووتی:

ئێمە لە بنەڕەتەوە نەخۆشی دڵمان بە میرات بۆ ماوەتەوە دەستی خستە سەر سنگی چاوەکانی داخست، داوام لیّکرد بڕۆینە نەخۆشخانە گووتی:

شوێنی باشتر لە نەخۆشخانە هەیە، لیّم گەڕێ با پشوو بدەم.

دڵم نەهات چیدی زۆری لیّبکەم بەدیاریەوە دانیشتم قورئانم بەسەردا خوێند تا خەوم لێکەوت بەیانی کچەکەت هات لەدەرگای دا بانگی کردم گووتی: مامۆژن کات درەنگی کردوە بۆ دەوام.

لەناو جێگە ڕاپەڕیم خێرا سەیری ئادەمم کرد دیار بوو قووڵ خەوتوە دڵم نەهات واگای بێنم، خۆم ئامادە کرد ڕۆیشتم بۆ دەوام، کات دەی پێش نیوەڕۆ بوو شاد پەیوەندی پێوە کردم هەواڵی مردنی باوکی پێ ڕاگەیاندم.

لەگەڵ گێڕانەوەی ئەم ڕۆژە ناخۆشە چاوەکانمان پڕ فرمێسک بوو.

ژاڵە دانیشتنەکەی جیّهێشت ڕۆیشت بۆ ژووری کتێبخانە لەویّ تێنوسێکی بۆ هێنام دایە دەستم گووتی:

سەیری بکە ئاواتی بوو تەواوی بکات، بەڵام هێواش بوو لە نوسین پەلەی نەدەکرد هەمیشە دوای دەخست دەیگووت:

بەڵکو وشەی باشتر و جوانتر بدۆزمەوە..

لەکۆتایی مەرگ مەودای نەدا کتێبەکە تەواو بکا.

تێنوسەکەم لیّوەرگرت سەیرم کرد وێنەی دایکی لەیەکەم پەڕ بە چەسپ گیری کردبوو بەخێرایی هەندیّ وشەم خوێندەوە و چەند پەڕێکم هەڵدایەوە زۆر دەستو خەتێکی جوانی هەبوو بەرگی تێنوسەکەم داخست، گووتم:

ئەگەر ئەو دەستنوسە بەمن بدەن دەمەوێ بیخوێنمەوە، پاشان ئاواتەکەی وەدی بێنم و چاپی بکەم.

ژاڵە گووتی:

سەرەتا ڕازی نەبووم بە چاپ کردنی داواشم لیێکرد هیچ نەنوسێت!

بەڵام ئێستا ئەو کتێبەم زۆر خۆشدەوێ پێم باشە چی زووترە پەلە بکرێ لە چاپکردنی.

بەو پەڕی خۆشحاڵیەوە ئەو کارە دەکەم تێنوسەکەم خستە سەر سنگم گووتم:

ئەگەر ئیزن بدەن دەمەوێ بڕۆمەوە تا چی زووترە کاری ئەم کتێبە تەواو بکەم.

گەڕامەوە ماڵ چوومە ژووری کتێبخانە دەرگام داخست لەسەر کورسی و مێزەکەی بەردەمم کڕ کەوتم هەتا دوا دێڕ هەموویم خوێندەوە. ئەوەی سەیر بوو گۆڕانکاری ژیانی ژاڵە بوو لەسەرەتاوە بە ژوولی خۆی ناساند و کەسێکی ئاسایی بوو پاش ناسین و هاتنە ناو ژیانی ئادەم تەواو گۆڕا بۆ کەسێکی دیندار و پەیوەست بە سرووتە ئایینیەکان کاریگەری ئادەمی زۆر بەسەرەوە بوو ڕەنگی دابۆوە لە ژیان و هەڵسوکەوتی.

بریارمدا تایپی بۆ بکەم ڕۆژانە دووسەد وشە کەمتر تایپم نەدەکرد، بە چەند ڕۆژێک کاری تایپ تەواو بوو.

بەڵام ئەو ڕۆژەی کەوا هەرگیز بیرم لێی نەدەکردەوە ڕووداوێکی وا بەسەرم دا بێت؛ هات.

لە دەوام بووم دراوسێکان پەیوەندیان کرد کەوا ماڵمان گڕی گرتوە. خێرا گەڕامەوە ئەوەی خەمم بوو کتێبخانەکە بوو ئەویش ببووە پارچەیەک خۆڵەمێش، لاپتۆپ و تێنوسەکە کەڵکیان بڕابوو!

نەمدەزانی چی بکەم وەک شێتم لێهاتبوو، لاپتۆپەکەم لەباوەش گرت بەئومێدی ئەوەی هاردەکەی سودێکی مابێت. دراوسێکان ئارامیان کردمەوە لەگەڵ تیمی بەرگری شارستانی ئاگرەکەیان کوژاندوە لە هەمان کات گەلابەیەکیان هێنا هەموو ماڵە سوتاوەکەیان لێبار کرد

نەمدەتوانی دەستەوەستان بم، بڕیارمدا بڕۆم بۆ لای دۆستێکم کە دووکانی چاککردنەوەی ئامێرە ئەلیکترۆنیەکانی هەبوو لەوێ پشکنین بۆ هاردەکە بکەین بەڵکو نوسراوەکان وەدەست بخەینەوە لە فەوتان بیپارێزین، گووتی: تەنها دوو ڕۆژ مۆڵەتم بدە.

منداڵەکان و دایکیان ڕۆیشتن بۆ ماڵی باپیرەیان تا خانوەکەمان نۆژەن دەکەینەوە منیش لە زانکۆ مامەوە نەرۆیشتم بۆ هیچ شوێنێک. چاوەڕێ نەبووم تا هەواڵی هاردەکە ببیستم ئاخۆ ئەویش سوتاوە یا ماوە، لە ژووری سەرۆکایەتی زانکۆ دانیشتم تا درەنگانی شەو ئەوەی لەبیرم مابوو لە تێنوسەکە سەرلەنوێ نوسیمەوە..

دەستم پێکرد بەشێکی باشم تایپ کردەوە بە کۆمپیتەری زانکۆ، لەهەر شوێنێک یا ڕووداوێکی ناو تێنوسە سوتاوەکە گرفتم بۆ دروست بوایە لەسەر تێنوسێکی بچوک وەک تێبینی دەمنوسی بۆ ئەوەی ڕۆژ بێتەوە بتوانم لەڕێی پەیوەندی زانیاری وەرگرم لە ژاڵە یاخود خوشک و براکانی ئادەم بۆ راست و دروستی بابەتەکە زیاتر جەختم لە قسەی ئەوان دەکردەوە.

کاتێکیش هاردەکەم وەرگرتەوە سوپاس بۆخوا تەواوی نوسراوەکە وەک خۆی هاتەوە بەردەستم لێم نۆڕی لە سەرەتاکەیدا دەڵێ:

(هەموومان ئەوینێک لە ژیان قەرزارین سەرپشکین ئاخۆ ئەم ئەوینە بەکێ دەبەخشین بە خودا و پەیامبەرەکەی؛ سەرەنجام لێی گەیشتن بە ڕەزامەندی خودایە، یا موڵک و سامانی دنیا کە ئەنجامەکەی بە هەلاکەتدانی ڕۆحە)

لەم چەند وشەیە بۆمان ڕوون دەبێتەوە ئادەم ئەوینی خۆی بەخشیوەتە خودا و ڕێبازی محمدﷺ و ئایینی ئیسلام، بە کرداریش سەلماندی، پڕۆژە پەروەردەیەکەی ساڵانە سەدان بانگخواز دروست دەکات.

لە دێڕێکی دیکە دا دەڵێ:

(ئەگەر ڕۆح ئاسودە بێت جەستە ئەرزشێکی نیە)

لێرەدا قسەکەی ژاڵەم بیر کەوتەوە کەوا گووتی: شەوی پێش مردنی گرنگی بە ژانی دڵی نەدا چونکە رۆحی ئاسودە بوو رەتی کردەوە بڕوات بۆ نەخۆشخانە.

پێچەوانەی هەمان ئەو بیرۆکەشم لە نێو دێرەکاندا خوێندەوە پیرە پیاوەکە دەڵێ:

(خودا ئەو بەندە چاکەکارەی خۆشدەوێ پێش ئەوەی مافی کەسی بەرامبەر بدات مافی جەستەی خۆی دەدات، ئەگەر کەسێک درک بە مافی جەستەی خۆی نەکات هەست بە مافی خەلکیش ناکات)

وام لێک دایەوە ئادەم

دنیای ئەو دیوی بەلاوە گرنگتر بووە وەک ئەم دنیا کاتیەی ئێستا بۆیە گرنگی بە ژانی دڵی نەداوە.

لە شوێنێکی دی باس لەگەورەیی پەیامبەر محمدﷺ دەکات دەڵێ:

(دەکرێ بەبێ پەیامبەریش خودا بپەرستی بەڵام هەرگیز نایناسی)

ئەگەر سەرنج بدەین و خورد بینەوە لەم دێڕە ئاماژەی بە گرنگی و پیرۆزی پەیامبەرﷺ کردوە پێش هاتنی، خەڵکی خودا پەرستیان دەکرد لە ڕێی بتەکانەوە، پەیامبەر محمدﷺ هات خودای ڕاستەقینەی پێ ناساندن.

ئەم ڕستەیەش سەرنجی ڕاکێشام نوسیویەتی:

(خۆشویستنی خودا بەدڵێکی پڕ ئیمان دەکرێ نەک لەفزی بریقەدار و کرداری ڕیایی)

دڵنیام ئەم ڕستەی لە ئەزمونی ژیانی خۆیدا نوسیوە، خەڵکانێکی زۆر ڕیاباز لە دەوری بوون تاوەکو سوود لە پڕۆژەکەی ببینن بازرگانی پێوە بکەن.

نزام وایە ئەم پیاوە مەزنە خودا کارو چاکەکانی لێقەبوڵ فەرموو بێ، پاداشتی بداتەوە بە فیردەوسی باڵا.

لە کۆتایی..

بەهەوڵ کۆششی من ئەم کتێبەی ئادەم بە چاپ گەیشت ئێستا ویژدانم ئاسودەیە دڵخۆشم بەوەی لە ڕۆژی دوایی ئەگەر ڕوو بەڕووی ئادەم بکرێمەوە کارێکم بۆی کردووە.

لەبەر هەبوونی ناکۆکی و ڕای جیاوازی زانایان لەسەر مانای عیشق کە دابەش بوون بەسەر دوو گرووپ، یەکەمیان:

زۆر ئاسایی بەکاری دێنن ماناکەیان بەوە لێک داوەتەوە دەڵێن عیشق کورت کراوەیە بەواتای (پەیوەندی بەهێز لە دڵەوە) دێت.

گرووپی دووەم:

بەکار هێنانی وشەی عیشق بەرامبەر خودا و پیرۆزیەکانی بە نادروست و گوناھ لە قەلەم دەدەن و دەڵێن شەهوەتی تێدایە (ئیبن قەییم) یەکێکە لە زانا دیارەکان.

بە مۆڵەتی ژاڵە و منداڵەکانی، ناوی کتێبەکەمان گۆڕی لە «عەرشی عیشق»ـەوە بۆ (من ئادەمم).

ئێستا ئێوارەی ڕۆژی پێنج شەممەیە لە دەرەوەی شارم کات پاش نوێژی عەسرە دانیشتووم لە ژێر سێبەری دار زەیتونێکی گەورە، لەبەردەمم سێ گۆڕ هەیە یەکیان ئادەمی هاوڕێمە کتێبەکەیم لەسەر کۆشم داناوە دەستەکانم بەرز کردوەتەوە دەپاڕێمەوە خودا بەزەیی و لێخۆشبوونی خۆی ببارێنێ بەسەر گشت بەندە موسڵمانەکانی و بەتایبەت ئادەمی هاوڕێم. پاشان گۆڕەکەیم چاک کردەوە خۆڵم خستەوە سەر بە ئەندازەی بستێک بڵندم کرد لەسەر ئاستی زەوی، کێلەکەم ڕاست کردەوە بە لادا کەوتبوو، تەنها بەردێکی درێژ بوو بێناونیشان، ژێر دار زەیتونەکەم خاوێن کردەوە گەڵا وەریوەکانم خستە روکنێکی پارچە زەویەکە گڕم دا، لە دووری سەد مەترێک بیری ئاو هەبوو ڕۆیشتم بە دەببە ئاوم هێنا بۆ دار و رشێنێکی گۆڕەکانیشم کرد

دەمێک بوو بۆنی خۆڵم نەکردبوو هەستێکی سەیرم بۆ دروست بوو وامزانی ئەوە بۆنی ئادەمە  چاوم پڕی فرمێسک بوو ئەو ئێوارەیە پڕ بەدڵ گریام. ئیدی هەرکات بۆنی خۆڵ بکەم ئادەمم دێتەوە یاد.

بەرلەوەی ئەوێ بەجێ بێڵم بۆ دوا جار ڕووم کردە گۆڕەکەی ئادەم گووتم: (..............-..)

گووتراوی ناو کەوانەکە نهێنیەک بوو درکاندنی بۆتۆی خوێنەر لەلایەن منەوە ناپاکیە بەرامبەر رۆحی ئادەم، بڕیارمدا ئەو باسە لەگەڵ ویدا لە گۆڕ بنێم.